


# ئافرەت لە مێژوودا



دانانی
دکتور إبراهیم طاهر معروف الربانی
پسپۆر لە پزیشکی کۆمەڵ
دکتورا لە دراساتی ئیسلامی

ناوی کتێب: ئافرەت لەمێژوودا
نوسینی: د. إبراهیم طاهر معروف الرّیاتي
نەخشەسازی ناوەوە: شنۆ حمدامین
نۆرە و سالی چاپ: دووەم/ 1430ك ـ 2009ز
شوێنی چاپ: بەیروت ـ لبنان
ژمارەی سپاردن: ( 240)ی سالی (2009)ی پێ دراوە.
تیراژ: (1500)دانە

﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِالْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٥٨﴾ يَتَوَارَىٰ مِنَ الْقَوْمِ مِن سُوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ ۚ أَيُمْسِكُهُ عَلَىٰ هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرَابِ ۗ أَلَا سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴾النحل: 58-59.

﴿فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لَا أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ ۖ بَعْضُكُم مِّن بَعْضٍ ۖ فَالَّذِينَ هَاجَرُوا وَأُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَأُوذُوا فِي سَبِيلِي وَقَاتَلُوا وَقُتِلُوا لَأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَلَأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ثَوَابًا مِّنْ عِندِ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ عِندَهُ حُسْنُ الثَّوَابِ ﴾ آل عمران:195.

# پێشکەشە

* هەموو ئەوبراو خوشکانەی کە خەریکی خوێندنەوەی مێژوویەکی ڕاستەقینەی بەڵگەدارن بۆ ئەوەی بگەنە ئەو ڕاستیانەی کە ڕێگەی ژیانیان بۆ ڕوناك و ئاسوودە دەکات.

* هەموو ئەوانەی هەوڵ دەدەن کەوا مافی ئادەمیزادان بەگشتی ومافی ڕاستەقینەی ئافرەتان پیادە بکرێت.

* هەموو ئەو خوشکانەی دەیانەوێت ڕێگەی ڕاست بدۆزنەوە، بۆ ئەوەی بەهۆیەوە بتوانن بەسەر کۆسپەکانی ژیاندا زاڵ بن.

# سوپاس وپێزانین

سوپاسی خۆم ئاڕاستەی هەموو ئەو بەڕێزانە
دەکەم، کە هاوکاریان کرد بۆ ئەوەی
ئەم پەڕاوە بێتە چاپ کردن و
بگاتە دەســـتی
خوێنەرانی بەڕێز.



# پێشەکی

هەروەك لای كەس شاراوە نیە ئەو بارودۆخەی كەوا ئافرەت تیای دەژیا لە سەدەكانی كۆن وشارستانیەتەكانی ڕابووردوو، كە پڕی بوو لە مەینەتی و دەردەسەری. هەر لە كاتی لەدایكبوونیەوە ئەو ئازارە دەستی پێدەكرد.

ئەوخێزانەی مێینەی بۆ لەدایكبووایە ئەوا لە سەرەتا شەرمەزاری وسەرشۆڕی وڕووگرژی ڕووی تێدەكرد، خۆیان بە سووك دەهاتە بەرچاو بەرامبەر بە خێزانەكانی تر، هەربۆیە بۆ ماوەیەك خۆیان دەشاردەوە تاوەكو نەزانرێ كەوا منداڵێكی مێینەیان بووە، جا هەندێك لەو منداڵانە زیندە بەچاڵ دەكران، ئەوانەی دەمانەوە لە ژیان، لە ژیانێكی پڕ ئێش وئازار دەژیان، هەروەك خوای گەورە باسی ئەو دیمەنە سەرسووڕهێنەرەمان بۆ دەكات، كە بەرزترین ئاستی دڵ ڕەقی وبێ بەزەیی ئەو كۆمەڵگەیانەمان بۆ دەردەخات ودەفەرمووێ: ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلۡأُنثَىٰ ظَلَّ وَجۡهُهُۥ مُسۡوَدّٗا وَهُوَ كَظِيمٞ ٥٨ يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓۚ أَيُمۡسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمۡ يَدُسُّهُۥ فِي ٱلتُّرَابِۗ أَلَا سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ ٥٩ لِلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ مَثَلُ ٱلسَّوۡءِۖ وَلِلَّهِ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾ النحل: 58-59.

ئافرەت وەك ئامێرێك بوو لە ژێر دەستی پیاو، زۆربەی كات بۆ ڕابواردنی بوو، بە چاوێكی كەم و سووك تەماشا دەركرا، هیچ جیاوازیەكیش نەبوو، كە ئەو ئافرەتە دایكە، خوشكە، كچە، یان هاوسەرە. لە كاتی هاوسەرێتی ئافرەتەكە هاوبەشێكی دۆڕاوی بێ دەسەڵات بوو، پیاو هەموو مافێكی بەسەر ئەوەوە هەبوو، بەڵام ئەو هیچ مافێكی نەبوو هەرچەندە هەندێ یاسایان دانابوو بۆ ژیانی هاوسەرێتی. لە هەندێ سەردەمدا ژمارەی فرە ژنی بێ سنوور بوو، ئەو ژمارەیەش هیچ ئامانجێكی ڕامیاری

یان کۆمەڵایەتی لە پشتەوە نەبوو، تەنها ئامانج تێر کردنی ئارەزووەکان بوو، تەڵاقیش هیچ یاسایەکی نەبوو زۆر جار بەبێ هۆکارێکی بەرچاو هەردوو هاوسەر لێك جیا دەبوونەوە، تەنها هۆکار ئارەزووی پیاوەکە بوو، تاوەکو بێبەشی بکات لە میرات، یان بێبەشی بکات لەو کەمە مافەی کە هەیبوو ئەویش(مارەیی) بوو بەبێ گوێدانە سۆزو خۆشەویستی ئەو ئافرەتە بۆ هاوسەرو منداڵەکانی. چەند هۆکارێکی تریان بەکار دەهێنا بۆ زیان گەیاندن بە ئافرەت، وەك (الظهار و الإيلاء) کە تیایدا پیاو سوێندی دەخوارد کەوا ئافرەتەکەی وەك پشتی دایکیەتی، یان سوێندی دەخوارد کەوا هەرگیز نزیکی ناکەوێتەوە، ئەوەش تەنها بۆ شکاندنەوەو سووکایەتی بوو، یان بۆ ئەوە بوو کەوا ئافرەتەکە هەندێ لە سامانی خۆی پێبدات یان بیبەخشێ لە هەندێ ماف. لەبەر ئەو جۆرە مامەڵە خراپ وناڕەوایانە، لەگەڵ قوورس وگرانی بڕی مارەیی لە هەندێ کۆمەڵگەی تر، بووە هۆی ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە کچ وکوڕ بەبێ ژیانی هاوسەری بمێننەوە، ئەوەش بووە هۆی بڵاوبوونەوەی بەدڕەوشتی وزۆربوونی زیناو تێکچوونی شیرازەی خێزان و کۆمەڵگا.

ئەو شارستانیەتانەی کەوا تەنها هەوڵیان داگیر کردن و تاڵانکاری بوو، تەنها نێرینە ڕۆڵی هەبوو، چونکە ئافرەتان بەشداری شەڕیان نەدەکردو هاوکاری باوکانیان نەکرد لە کارەکانیان، وایان هەست دەکرد کەوا مێینەکان بوون بەبارگرانی بۆیان بۆیە هەر بە سووك تەماشا دەکران. بەبێ هەڵاوێردان لە هەموو شارستانیەتەکان مافی ئافرەت پێشێل کرابوو، لەگەڵ بوونی هەندێ جیاوازی لە جۆری مامەڵە کردن وجۆری ئەو پێشێلکاریانە.

ئەگەر بێینە سەر باسی گوزەرانی ئافرەت لە هەندێ لە کۆمەڵگەکانی تر، وەك: کۆمەڵگەکانی ڕۆئاوا لە سەدەکانی ناوەڕاست وبگرە لە سەدەکانی دوای سەرهەڵدانی شۆرشی پیشەسازی وسەدەی بیستەم وبەسەرەوە، دەبینین هەر بە هەمان شێوە ئافرەتان لە ژیانێکی نالەبارو نا ئاسوودە دەژین، بەلام بە شێوەیەکی وا بۆیان ڕازاندراوەتەوە گوایە ئەوە ماف وئازادی وسەربەستیە پێویستە ئافرەت بەدەستی بهێنێ، وایان گوش کردبوو کەوا ژیان تەنها دونیایەو پێویستە چیت بە ئارەزوودا دێت

ئەنجامی بدەیت وخۆت تیایدا بێبەش نەکەیت، بەبێ گوێدانە هیچ یاساو ڕێساو داب ونەریتێك، ئەگەر ئەوە نەكات ئەوا بەدواكەوتوو، نا ڕۆشنبیر لەقەڵەم دەدرێت، هەموو ژیانی بە فیڕۆ چووە.

ئەمە لەلایەك لەلایەكی ترەوە ئاینی ئیسلام بنەمای ئەو جیاوازی ولاسەنگیەی نێوان نێرینەو مێینەی گۆڕی بە دانانی چەند دەستوورەكی بنەڕەتی:

1- هەردوو ڕەگەز لە بنەڕەتەوە لە یەك دایك وباوك بوونە، كەواتە لە مرۆڤایەتیدا یەكسانن.

2- هاوكێشەی نزیكی ودووری لە خواوە، تەنها تەقواو بەندایەتیە، نەك ڕەگەزو نەتەوەو شێوەو سامان وسالاری ودەسەڵاتی ماڵەوەو دەرەوە.

3- لە سزاو پاداشتی كارەكان یەكسانن لە دونیاو لە دوارۆژ.

4- لە ئەرك وفەرمانەكانیش یەكسانن، تەنها هەندێك ئەرك لەسەر ئافرەت سووك كراوە بە شێوەیەكی كاتی، ئەویش لە بەر ڕەچاوكردنی پێكهاتەی خۆڕسكی خودی ئافرەتە، یان لەبەرچاوگرتنی شیاوی وگونجاوی.

ئاینی ئیسلام بۆ بەرقەرابوونی ئاسوودەی خێزان وژیانی هاوسەرێتی دابین كردنی مافی ئافرەتان سێ ڕێگەی گرتۆتە بەر:

1- قەدەغە كردنی هەموو ئەو داب ونەریتە هەڵەو ونالەبارو زیان بەخشانەی هەبوون لەناو كۆمەڵگا.

2- ڕاست كردنەوەو پاككردنەوەو تەتەڵە كردنی هەموو ئەو داب ونەریتە لارو چەوت وژەنگ گرتووانەی هەبوون لەناو كۆمەڵگا.

3- داڕشتن ودانانی بەرنامەو یاسای نوێ تاوەكو چوارچێوەی خێزان وكۆمەڵگە بەداب ونەریتی جوان پتەو بكات، كۆمەڵگەیەكی ساغ ودروست وبەرز دابمەزرێنێ.

لەم بارەیەوە ژمارەیەكی زۆر لە ئایات وفەرموودە هەن كەوا ئەو بنەمایانە دەچەسپێنن، كەواتە بۆ موسڵمانی ڕاستەقینەو دروست نیە لەو بەرنامەیە لابدات و مافی ئافرەت پێشێل بكات، جا لە هەر سەردەمێك وكاتێكدا بێ، لەناو هەر نەتەوەیەك

و کۆمەڵگایەکدا بێ، یان لەهەر بارێکی ئابووری یان کۆمەڵایەتیدا بژیت.

ئەو ئافرەت وپیاوانەی لەناو ئەو نەفامیانە ژیانیان بەسەر بردبوو، کاتێ ئەگەنە ڕاستەقینە ولە بەرنامەکەی خوا دەگەن، جا چ بە خوێندنەوەو لێکۆلینەوە، یان بە واقیع وکرداری موسڵمانان بێ، ئەوا ڕاستەوخۆ بەدەمیەوە دەچن، ئەو کات بۆیان دیار دەکەوێت ئەو ئاینە چ جۆرە بەرنامەیەکی هاوسەنگ و ماف دابینکەرە بۆ ئافرەت، جا چ لە تەمەنی کۆرپەلە بێ، یان منداڵ ، یان گەنج ، یان پیری و پەککەوتە، هەروەها ئەگەر ئافرەتەکەش دایك بێ، یان خوشك ، یان کچ، یان هاوسەر.

لەو بابەتە دەمانەوێ ئەرك ومافی ئافرەتان باس بکەین لە سەردەم وشارستانیەت وئاین ونەتەوەو کۆمەڵگە جیاجیاکان، بۆ ڕوون کردنەوە و گەیشتن بە بنچینەو ڕاستەقینەی هەر یەکێك لەو بەرنامەو بانگەوازە جیاجیایانە، تاوەکو خوێنەری بەرێز خۆی بڕیار بدات لەسەر گونجاوی و شیاوی هەر یەکێك لەو بەرنامانە، هەروەها بەمەبەستی سوود وپەند وەرگرتن لەو ڕووداوە مێژوویانە.

ئەگەر لە بۆچوونەکانم ڕاستم پێکابێ ئەوا بە فەزڵی خوای گەورە بووە، ئەگەر هەڵەم کردبێ ئەوا لە نەفسی وخۆم وشەیتانەوە بووە، داواکارم خوای گەورە ڕێگەی ڕاستمان بۆ ڕوناك بکاتەوە و ڕێنمایمان بکات بۆ گوفتارو کاری چاکەو خێر.

لە کۆتایدا ئامادەین بۆ وەرگرتنی هەر پێشنیارێکی سوود بەخش و زانیاریەکی ڕاست دروست تاوەکو بابەتەکەمانی پێ زیاتر توندوتۆل وسوودمەندتر بکەین.

وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على سيد المرسلين.

د. إبراهيم طاهر معروف
هەولێری پایتەخت
2009/2/2

# بەشەکانی ئەم پەڕاوە

# بەشی یەکەم

## ئافرەت لە ئاینی زەرادەشتی و شارستانیەتی بابلی دا

باسی یەکەم : ئاینی زەرادەشتی

بەندی یەکەم : کەسایەتی وسەردەمی دەرکەوتنی وکتێبەکەی

بڕگەی یەکەم : زەرادەشت کێ یە؟

بڕگەی دووەم : ئەو سەردەمەی کە زەرادەشت تیایدا ژیاوە

بڕگەی سێیەم : کتێبی زەرادەشت وبەڵگەکانی پێغەمبەرێتی زەرادەشت

بڕگەی چوارەم : زەرادەشت و ئاگر پەرستی

بەندی دووەم : ئاینی زەرادەشت

بڕگەی یەکەم : خوو ڕەوشت لە ئاینی زەرادەشتیدا

بڕگەی دووەم : ئافرەت لە ئاینی زەرادەشتیدا

یەکەم : گرنیەندی ژن هێنان

دووەم : مارەیی

سێیەم : ناهەنگ گێڕان چوارەم : تەڵاق – دابڕان

پێنجەم: جۆرەکانی هاوسەرشەشەم: میرات

حەوتەم: سزاکان

بەندی سێیەم: بیرۆکەی مانەوی ومەزدەکی

برگەی یەکەم: بیرۆکەی مانەوی

برگەی دووەم: بیرۆکەی مەزدەکی

## باسی یەکەم: ئاینی زەرادەشتی

### بەندی یەکەم: کەسایەتی وسەردەمی دەرکەوتنی وکتێبەکەی

زۆربەی مێژوو نووسە بیانیەکان وکوردەکان لەو باوەڕەدان کەوا لە پێش هاتنی ڕوناکی ئاینی ئیسلام ئاینی کوردو فارسەکان زەرادەشتی بووە، بۆیە هەندێك بە درێژی باسی دەکەم بەتایبەتی ئەو بەندانەی پەیوەندی هەیە بە ئافرەتەوە. هەروەها باسێکی کورتی ئاگر پەرستی وبیرۆکەی مانەوی ومەزدەکیش دەکەم کەوا لەناو گەلانی ناوەڕاستی ئێران پەیدا بوون، تەمەنی ئەو دوو بیروباوەڕە کورت بوو، بەڵام کاریگەریان بۆ چەند سەدەیەك ماوە، هەرچەندە لە هیچ سەرچاوەیەکی فارسی و کوردی نەماندیووە، لە هیچ نووسەرێکی بیانیش نەبیستراوە کەوا کوردەکان بەلای ئەو دوو بیروباوەڕەدا چووبن، چونکە زۆربەی ئەم بیرۆکانە لەناوچەی شانشینەکان بووەو زۆر بڵاو نەبۆتەوە ناو قووڵایی کۆمەڵگا. بەڵگەشمان ئەوەیە ئەگەر لەهەر خوێنەرو ڕۆشنبیرەکی کورد پرسیار بکرێ دەربارەی ئەو دوو بیروباوەڕە، ئەوا هیچیان دەربارە نازانێ، بەڵام بە پێچەوانەوە زۆر شت دەزانێ، یان زۆر شتی بیستووە دەربارەی ئاینی زەرادەشتی.

#### بڕگەی یەکەم: زەرادەشت کێ یە؟

زەرادەشت کوڕی بۆشەب، لە سەردەمی شا (کیشتاسب کوڕی لەهراسەب)بووە. باوکی خەڵکی ئازەربەیجانەو دایکی خەڵکی ڕەییە وناوی (دەغدەویە)یە.

لەو سەردەمەدا باوەڕیان بە دوو خوا هەبوو: خوای خێر (ئەهرۆمەزدا) کە حەوت سیفەتی هەیە: ڕوناکی، عەقلی پاك، هەق وڕاستی، دەسەڵات، تەقوا، خێر، مانەوەی هەتا هەتایە. خوای شەڕ (ئەهریمەن): پێشەوای تاریکی، پاشای جیهانی ژێرەوە، هەر ئەوە تاریکی هەموو ئەو نەهامەتیانەی داهێناوە کە دێنە ناو ژیانی مرۆڤەکان، مێرووە زیان بەخشەکان، تاوان، بەدڕەوشتی، هەموو ئەو نەهامەتیانەی دێنە ناو ژیانی مرۆڤەکان.

ئەو بنەمایەش بریتیە لە ڕوناکی وتاریکی، کە دوو سەرچاوەی دژ بەیەکن. ڕوناکی بوونێکی ڕاستەقینەی هەیە، تاریکی بوونێکی ڕاستەقینەی نیە، وەك سێبەری کەسێك وایەو بەدواوەی دەڕوات بەڵام بوونی ڕاستەقینەی نیە، خوای گەورەی تێکەڵاوی کردوون بۆ حیکمەتێك کە خۆی دەیزانێ، لەو تێکەڵاویەش شێوەو پێکهاتەی جیا دروست بوون.

ئاینی زەرادەشتی لەو بنەمایانە پێکهاتووە: پەرستنی خوا، باوەڕ نەهێنان بە شەیتان، فەرمان بەچاکەو ڕێگرتن لە خراپە، دوور کەوتنەوە لە شتە پیسەکان.[1]

زەرادەشت دەستی کرد بە بانگەشە لەناو کۆمەڵگا زۆر بە ڕاشکاوی ئاشکرای کرد کەوا تەنها یەك خوا هەیەو ئەویش(ئەهرۆمەزدایە)، کە ڕوناکیەو دروستکارو خولقێنەری زەوی و ئاسمانەکانە، ئادەمیزادان سەربەستن لە بیرو بۆچوون، چونکە ئەهرۆمەزدا دەیەوێت ئادەمیزادان هەموو مافی هەڵبژاردنی بیروباوەڕی خۆیان هەبێت، کام ڕێگە هەڵدەبژێرن ڕوناکی یان تاریکی. زەرادەشت بە باوەڕدارانی شوێن کەوتەی خۆی ڕاگەیاند، کەوا ململانەی نێوان خێرو شەڕ کۆتایی دێت بەسەر کەوتنی خێرو چاکە وکەسانی دادوەرو ڕاستگۆ، شوێن کەوتوانی شەڕو خراپەش لەناو دەچن وشەڕو خراپەش هەر بوونی نامێنێ. هەموو چاکەکاران دەگەڕێنەوە بۆ لای ئەهرۆمەزدا لە بەهەشتدا، خراپەکاران دەکەونە ناو کونێکی تاریك، هەتا هەتایە ژەهراویان بەدەمدا دەکەن.[2]

## بڕگەی دووەم: ئەو سەردەمەی کە زەرادەشت تیایدا ژیاوە

مێژوو نووسەکان ڕایان جیاوازە لەسەر ئەو سەردەمەی کەوا زەرادەشت تیایدا ژیاوە،(هـ.جز ولز) خاوەنی کتێبی(معالم تاریخ الإنسانية): ئەو سەردەمەی کە زەرادەشتی تیایدا ژیاوە ڕوون نیە، زۆر لەو کەسانەی جێگەی متمانەن دەیگێڕنەوە بۆ 1000 ساڵ پێش زاینی، واتە پێش قۆرشی گەورە دامەزرێنەری دەوڵەتی

---

1 ــ الشهر ستاني، محمد بن عبد الكريم، الملل والنحل، ص193.
– المسعودي ، مروج الذهب، 299/1. دەڵێ: زەرادەشت کوڕی ئاسبیمان.
2 ــ ول ديورانت ، قصة الحضارة، 3/ 426.

ئەخمینیەکانی فارسی بووە.[1]

بەڵام ول دیورانت دەڵێ[2]: مێژوو نووسە نوێیەکان مێژووی زەرادەشت دەگەڕێننەوە بۆ نێوانی سەدەی شەشەم و حەوتەمی پێش زاینی، بەڵام هەندێکی لە مێژوو نووسان وەك، عەباس عەبدوالهادی لە کتێبی (المرأة والأسرة)[3] وتۆماس بوا لە کتێبی (تاريخ الأكراد)[4] دەڵێن: لە سەردەمی باوکی دارای گەورە ژیاوە.

ئاینی زەرادەشتی لە نێوان سالانی 650–550 پێش زاینی بووە ئاینی ڕەسمی وولاتی فارس زیاتر له10 سەدە.

## بڕگەی سێیەم: کتێبی زەرادەشت وبەڵگەکانی پێغەمبەرێتی زەرادەشت

ئەو کتێبەیە کەوا هاوەڵەکانی زەرادەشت کۆیان کردۆتەوە، کە بریتیە لە هەندێ یاساو نزاو پاڕانەوە، ووتەکانی زەرادەشت بە ناوی ئاڤێستا یان ئەبستاق، لای عەرەبەکانیش بە (الزند- آبستا) ناسراوە. عەباس هادی دەڵێ: کتێبی ئاڤێستای کۆن نووسرابوو لەسەر120 پێستەی مانگا.[5]

لای خۆم وا مەزەندە دەبەم وە پەسەندی دەکەم کەوا زەرادەشت پێغەمبەری فارس وکورد بووە، چونکە خوای گەورە بۆ هەموو نەتەوەیەك پێغەمبەرێکی ناردوە تاوەکو بەزمانی خۆیان ڕێگەی ڕاستیان بۆ ڕوون بکاتەوە، بێگومان ئەو دوو نەتەوە گەورەیە لەو کات بەبێ پێغەمبەر نەبووە، هەروەك نەتەوەکانی تری سەر زەوی. بەڵگەمان بۆ ئەو ڕایە وپەسەند کردنی ئەمانەن:

یەکەم: ئاياتی قورئان

1- ﴿وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ﴾فاطر: 24. واتە: هەموو نەتەوەیەك

---

1 ــ هـ .ج. ولز، معالم تاريخ الإنسانية، 750/3 .
2 ــ ول ديورانت، قصة الحضارة، 425/3.
3 ــ عبد الهادي عباس ، المرأة والأسرة، 276/1.
4 ــ توماس بوا ، تاريخ الأكراد، ص119.
5 ــ عبد الهادي عباس ، للمرأة والأسرة، 276/1.

پێغەمبەری هەبووە.

2- ﴿ وَمَآ أَهۡلَكۡنَا مِن قَرۡيَةٍ إِلَّا لَهَا مُنذِرُونَ ﴾ ﴿الشعراء:208﴾.واته: هیچ شارێکمان لەناو نەبردووە، بەبێ ئەوەی ئاگاداریکردیان بۆ نەچووبێ.

ئیمامی ئیبن حەزم [1]، دەربارەی ئاینی زەرادەشتی دەڵێ: زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن کەوا پێغەمبەر بووە، هەروەك ئیبن موحەمەد دەڵێ: لە پێش پێغەمبەر موحەمەدﷺ هەر یەکێك موعجزەی هەبێ وخەڵکی بۆ چاکەو خوا پەرستی بانگ کردبێ، ئەوا دەتوانرێ لە بازنەی پێغەمبەرایەتی دابنرێ، هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِن مِّنۡ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴾ فاطر :24. هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَرُسُلًا قَدۡ قَصَصۡنَٰهُمۡ عَلَيۡكَ مِن قَبۡلُ وَرُسُلًا لَّمۡ نَقۡصُصۡهُمۡ عَلَيۡكَ ﴾ النساء: 164.

دووەم: وەرگرتنی جزیە لە فارسەکان لە سەردەمی پێغەمبەری خواﷺ، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوە، ئەوانە خاوەنی کتێبن وپێغەمبەریان بۆ هاتووە. چونکە جزیە تەنها لەوانە وەرگیراوە کە خاوەن کتێبن، ئەوانی تر بۆیان نەبوو جزیە بدەن. هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلۡحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حَتَّىٰ يُعۡطُواْ ٱلۡجِزۡيَةَ عَن يَدٖ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ ﴾ التوبة : 29.

سێیەم: لە ئاڤێستادا هاتووە باوەڕ هێنان بەخوا وڕۆژی دوایی، بەهەشت و ئاگر، دژایەتی کردنی شەیتان، فەرمان بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپە، دوور کەوتنەوە لە خواردنەوەی مەی وسەرخۆشکەرەکان.

چوارەم: هەموو زاناو مێژوو نووس ولێکۆڵەرەوەکان لەو باوەڕەدان کەوا یاساکان وبەندەکان وڕێنمایەکانی ناو ئاڤێستا باشترو چاکتر بووە لە هەموو ئەو کتێبانەی بە

1 ـ ابن حـزم الظاهري، الفصل في الملل والأهواء والنحل، 196/1 وما بعدها. والـدينوري، أبو حنيفة، أحمد بن داود: الأخبار الطوال، 25/1 .

ناوی ئاینەوە هەبوون لەو کات وسەردەمانەدا.

کتێبی زەرادەشتی وئاینەکەی بە گشتی زۆر گۆڕانکاری هاتە سەر، لەسەر دەستی بەناو پیاوانی ئاینی، هەروەك چۆن هاتە سەر کتێبەکانی تری پێش ئەو وەك(تەورات) و دوای ئەویش(ئینجیل). خوای گەورە پاراستنی ئەو کتێبانەی خستبووە ئەستۆی شوێن کەوتووەکانی، ئەوانیش لە جیاتی پاراستنی وخزمەت کردنی دەستیان کرد بە گۆڕینی بە گوێرەی ئارەزوویان بۆ بەرژەوەندی خۆیان وگەورەکان ودەسەلاتدارەکان، لە جیاتی پاراستنی ئەو بەرنامەیە، خۆیان بەو دەپاراست وسامانیان پێ کۆدەکردەوە. هەروەك خوای گەورە لە قورئان باسیان دەکات کەوا چۆن ئەو کارە ناپەسەندو ناهەمووارە ئەنجام دەدەن و فەرمانەکانی خوا پشت گوێ دەخەن. ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَا ٱلتَّوْرَىٰةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ ۚ يَحْكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسْلَمُوا۟ لِلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلرَّبَّـٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ بِمَا ٱسْتُحْفِظُوا۟ مِن كِتَـٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُوا۟ عَلَيْهِ شُهَدَآءَ ۚ ﴾ المائدة: 44.

بەلام قورئانی پیرۆز خوای گەورە پاراستنی گرتۆتیە ئەستۆ خۆی، هەر بۆیەش کەس ناتوانێ بیگۆڕێ و دەستکاری بکات، موعجزەیە تاوەکو ڕۆژی دوایی. ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَـٰفِظُونَ ﴾ الحجر: 9.

## بڕگەی چوارەم: زەرادەشت و ئاگر پەرستی ( الزرادشت والمجوسية )

ووشەی (المجوس)[1] لە بنچینەوە ووشەیەکی عەرەبی نیە، بەلکو لە ووشە بە عەرەبی کراوەکانە، هاتووە لە ووشەی فارسی (مغوس–Maghas) کە بە واتای ئاگر پەرست (عابد النار) دێت ، هەر هەمان ووشە چووەتە ناو زمانی لاتینی بووە بە (Magi) کە کۆی ووشەی(Magus).

زانای مەجوسی و گەورەی ڕوحی ناسراوە بە (الموبذان موبذ)، لەناو موسلمانان ئەو پلەو پۆستە دەلێن سەرۆکی قازیەکان (قاضي القضاة). لە سەردەمی زەرادەشت

1 ــ جواد علي ، المفصل في تاريخ العرب قبل الإسلام، 691/6.

ڕێگە نەدەدرا بە دروست کردنی پەیکەرو بت، بەڵکو ئاگریان دەکردەوە لە شوێنە بەرزەکان وەك ڕێزێك وبەرزڕاگرتنی ئەهرۆمەزدا، چونکە دەیان گووت ئاگر نیشانەی ڕاستی دادوەریەو ململانێیە لەگەڵ هێزی شەڕو تاریکی. بەڵام لەگەڵ دەرکەوتنی ئاینی مەسیحی، واتە دوای زەرادەشت بە پێنج تاوەکو شەش سەدە، ئاگر پەرستی بڵاوبۆوە لەناو فارسەکان، کتێبی زەرادەشتیان پڕ کرد لە وێنەی تەلیسماوی گوایە بۆ چارەسەری نەخۆشی باشە، هەروەها ژمارەیەکی زۆر لە سیحرو جادوویان خستە ناو ئاڤێستا. لە هەموو شارە گەورەکان ئاگردانیان دروست کرد. لە سەرەتای سەدەی حەوتەمی دوای زەرادەشت، پیاوانی ئاگردان ناوی زەرادەشتیان خستە ناو ئاگر پەرستەکانەوە، خۆشیان گەیاندە پۆستە بەرزەکان وپلەی پاشا وشاهینشاهەکان، لە زۆر کات پاشاکانیان بە قوتابی خۆیان لە قەڵەم دەدا، نەدەبوو شا هیچ کارێك بێ پرسی ئەوان ئەنجام بدات.

بەمەش دوای حەوت سەدە، ئاینی زەرادەشتی لە پلەی بەرزی خوا پەرستی و یەکتاپەرستی، گۆڕدرا بە ئاگر پەرستی، لە بەرزی پلەی خووڕەوشتەوە دابەزی بۆ نزمترین پلەی بەدڕەوشتی بە تایبەتی دوای بەرپا بوونی بیرۆکەی مانەوی(215 زاینی)و مەزدەکی (529 زاینی).

لە قورئانی پیرۆز یەك جار ناوی مەجوسی هاتووە: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلصَّـٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَـٰرَىٰ وَٱلْمَجُوسَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴾ الحج: 17. واتە خوای گەورە ڕۆژی دوایی شوێن کەوتوانی هەموو ئاین ومەزهەبەکان لێك جیا دەکاتەوە، چونکە خۆی ئاگادارو شاهیدە بەسەر هەموو شتێکدا. هەروەها لەیەك فەرموودەی پێغەمبەرﷺکە ئەبو هورەیرە ﷺ دەیگێڕێتەوە ناوی مەجوسی هاتووە:((ما من مولود إلا يولد على الفطرة، فأبواه يهوّدانه، أو ينصّرانه، أو يمجّسانه ، كما تنتج البهيمة بهيمةً جمعاء، هل تحسون فيها من جدعاء)).[1] هەروەها ئیبن عومەر وەسفی ئەهلی قەدەریەکان دەکات بە مەجوسی

1 ـ البخاري 29- الجنائز باب: 78 حديث: 1293، 456/1.

ئوممەتی ئیسلام. ((مجوس هذه الأمة القدرية...))[1]

لە سەردەمی ئێستادا تەنها ژمارەیەکی کەم لە شوێن کەوتوانی ئایینی زەرادەشتی ماون لە ناوچەکانی فارس لە ئێران و لە نێوان پارسیەکان parsees لە هیندستان، ژمارەیان دەگاتە 90000 کەس. تاوەکو ئێستا مردووەکانیان لەناو تاوەری بەرزی تایبەت دەنێژن، بە ناوی تاوەری مل کەچی وبێدەنگی.[2]

## بەندی دووەم: ئایینی زەرادەشت

### برگەی یەکەم: خووڕەوشت لە ئایینی زەرادەشت

سروشتی مرۆڤایەتی لە دیدی ئایینی زەرادەشتی بریتیە لە گۆڕەپانی جەنگ ، کە ململانێی تیادا ڕوو دەدات لە نێوان کەسانی چاك وکەسانی خراپ، نێوان ڕووناکی وتاریکی، بەهۆی ئەو ململانێیە جۆری ئادەمیزادەکان دیار دەکەون. کەسانی چاك ئەوانەن کەوا هاوکاری خەڵکانی تر دەکەن لەسەر کاری باش، دژایەتی کەسانی خراپیش دەکەن.

لەسەر بنەمای گوتەی چاك وکردەوەی چاك، سیفەتی پیاوانی خوا پەرست دیار دەکەوێ.[3]

بیروباوەڕی چاك وپاك ئەوەیە: خۆشەویستی ئەهرۆمەزدا، باوەڕ هێنان بەوەی هەموو چاکەیەك لەلایەن ئەوەوە دێت، دوور کەوتنەوە لە بێ باوەڕی وخۆ بەزل زانین و ئیرەیی.

ووتە وکاری چاك وباش: ئەنجامدانی ئەرکە ئاینیەکان، تەقوای خوا، بەخشینی سامان، هاوکاری کردنی بۆ هەژاران، دوور کەوتنەوە لە قەدەغە کراوەکان، دروست کردنی خانوو، چاککردنی زەوی وزار، چاندنی دانەوێڵە، هەڵکەندنی بیرو ئاودێری

1 ــ مانــع الجهني، الموسوعة الميسرة، 1124/2.
2 ــ ول ديــورانــت ، قصة الحضارة، 437/3.
3 ــ ئيرنيا حسن، تاريخ إيران القديم، ص309.

کردن، ناشتنی دارو درەخت، بەزەیی وچاودێری کردنی ئاژەڵ، خۆشەویستی دراوسێ، ئەمانەت وناموس پاراستن، وەرنەگرتنی ریبا وسوو، دانەوەی قەرز.[1]

لەلایەکی ترەوە دەڵێ: لەسەرووی هەموو گوناهەکان بێ باوەڕیە، ئەوەی لە ئاینی خۆی پەشیمان بێتەوە سزاکەی هەر کوشتنە، یەکەم شت لەسەر ئادەمیزاد پێویستە بیکات خواپەرستیەکی پاك ونوێژو خۆبەخت کردنە لە پێناو دین.

پیرسیا حەسەن دەڵێ: کاتی ئاریەکان بەو ڕەوشتە جوان هاتنە ئاسیای ڕۆژئاوا، بوونە هۆی وەرچەرخاندو بەرەو ڕەوشتی جوان، کە هۆکارێك بوو لە هۆکارەکانی پێشکەوتنی شارستانیەتی ئەو سەردەمەی مرۆڤایەتی.[2] هەروەها ول دیورانت دەڵێ: ئەگەر سەیری ئەو ئاینە بکەین دەبینین ئاینێکی زۆر جوان وبەرچاوە، زۆر بەدەگمەن گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە بەبەراورد لەگەڵ ئاینەکانی تری سەردەمی خۆی، نەدەبووایە ئاوا بەئاسانی وخێرایی دوای چەند سەدە لەناو بچێت.[3]

## بڕگەی دووەم: ئافرەت لە ئاینی زەرادەشتی

لە ئاینی زەرادەشتی خێزان پیرۆزترین بنەمای کۆمەڵایەتی بوو، باوکەکان هەوڵی ئەوەیان دەدا کەوا زوو ژن بۆ کوڕەکانیان بهێنن پاش گەیشتن بە تەمەنی پێگەیشتن[4]. یەکێك لە بنەما سەرەکیەکانی فێرکردنی ئاینی زەرادەشتی ئەوەیە کەوا هانی گەنجان بدەن زوو ژن بهێنن، ئەوەی ژنی هێناوە چاکترو باشترە لەوەی ژن ناهێنێ، چونکە کۆمەڵ پێکهاتووە لە ژمارەیەك لە خێزانی چاك وباش، ئەو پیاوەی منداڵی زۆرە لە خوا نزیکترە چونکە ژمارەی باوەڕدارانی زیاد کردووە[5]. ئاڤێستا دەڵێ: ئەو پیاوەی ژنی هەیە بەرزترو چاکترە لەو پیاوەی ژنی نی یە، ئەو پیاوەی بژێوی خێزانێك دەکات چاکترە لەوەی خێزانی نی یە، ئەوەی منداڵی زیاترە باشترە لەوەی منداڵی کەمە،

---

1 ـ بيرثيا حسن ، تاريخ ايران القديم ، ص309.
2 ـ بيرثيا حسن ، المصدر نفسه ، ص328.
3 ـ ول ديورانت ، قصة الحضارة، 435/3.
4 ـ ول ديورانت ، قصة الحضارات 439/3. عبد الهادي عباس، المرأة والأسرة، 276/1.
5 ـ ول ديورانت ، قصة الحضارات، 440/3. عبد الهادي عباس، المرأة والأسرة، 277/1.

ئەوەی ماڵ و سامانی زۆری هەیە بۆ خێر، چاکترە لەوەی سامانی نی یە.[1]

لایان پەسەند نەبووە ئەو پیاوەی ژنی نەبووە، لەسەر سەربازەکانیان وپیاوانی ئاینی پێویست بووە کەوا خێزاندار بن، لە ئاینی زەرادەشتی فرە ژنی جائیز بووە و چونکە کۆمەڵگەکانی ئەو کات کۆمەڵگەی جەنگ وشەڕ بوون وپێویستیان بە نەوەی زۆر بووە. ئاینی زەرادەشت هانی ئەوەی داوە کەوا ئافرەت داوێن پاك و ڕاستگۆ بێت، ڕێگەشی لە فەسادو بەدڕەوشتی گرتووە. ئاینی زەرادەشت پەیوەندی نێوان نێرو مێی لە ڕێگەی ژیانی هاوسەرێتی شەرعی پەسەند کردووە وبەیەکێك لە فەرمانەکانی ئاینی داناوە. لە بارەی زینا ئاڤێستا: زۆر بە توندی سەرزەنشتی کرداری نزیك بوونەوەی نا شەرعی دەکات لە نێوان هەردوو ڕەگەزدا، هەروەها سەرزەنشتی ئافرەتی بەد ڕەوشت دەکات ، کە دەڵێت: (ئەو ئافرەتانە تەنها تێرمانینیان سێ یەکی ئەو ئاوەی لە چیاکان دێتە خوارەوە تورە دەکاو پیسی دەکات، سێ یەکی ئەو ڕووەکە ڕەنگ ئاڵتونیانەی لە کاتی گەشەکردندان لەناو دەبات).[2]

**یەکەم: گرێبەندی ژن هێنان ( عقد الزواج )**

نێرینە سەربەست و ئازاد بووە لە دیاری کردن وهەڵبژاردنی هاوسەرەکەی، ئافرەتیش ئازاد بووە لە وەرگرتن یان ڕەتکردنەوەی ئەو هاوسەرێتیە، واتە لە ڕووی کردارییەوە ئافرەت سەربەست بووە لە دیاری کردنی هاوسەری ژیانی.[3]

پاش ئەوەی هەردوو هاوسەرەکە پەیمانی ژن هێنانیان واژوو دەکرد، ئەوە ئاهەنگێکی ئاینیان بۆ ساز دەدان، پیاوێکی ئاینی لەوێ ئامادە دەبوون بۆ دڵنیا بوون لەو پەیمان و بەڵێنانەی نێوان هەردوو هاوسەر. پاشان پیاوە ئاینیەکە دەستی دەکرد بە نووسینی پەیمانەکە ومەرجەکانی، دوایی سوێندی ئەوەی دەدان کەوا ئەو پەیمانە بەجێ بگەیەنن وخیانەت وناپاکی نەکەن لەگەڵ یەکتری. زۆربەی ئەو هاوسەریەتیە

1 ــ ول ديورانت ، قصة الحضارات، 440/3. عبد الهادي عباس، المرأة والأسرة، 277/1.
2 ــ عبد الهادي عباس، المرأة والأسرة، 282/1 .
3 ــ عبد الهادي عباس، المرأة والأسرة، 281/1.

لەکاتی بەهار ئەنجام دەدرا، چونکە لەو کاتانەدا سروشت زۆر جوان ڕازاوەتەوە.

مەعن خەلیل لە کتێبی ( زانستی کۆمەڵایەتی خێزان– علم اجتماع الأسـرة): ئەو جۆرە ژن هێنانەی باسمان کرد بە ئامادەبوونی پیاوانی ئاینی، ئاهەنگ گێڕانی ئاینی لەناو پەرستگاکان، هەمووی بۆ ئەوەیە تاوەکو ئەو هاوسەرێتیە ئاشکرا بکرێت وخەڵکان بیزانن. واتە ئەو هاوسەرێتیە بۆ دوو جۆر یاسا ملکەچ دەکات: یەکەمیان کۆمەڵایەتیە، تاوەکو ئادەمیزاد نەتوانێ وا بە ئاسانی لە ژێر باری بێتە دەرەوە، دووەمیان ئاینی یە، کەوا ئەو کارە پیرۆزە، حەرامە ناپاکی کردن لەگەڵ ئەو پەیمانە. [1]

**دووەم: مارەیی**

مارەیی مافێکی ڕەوای ئافرەت بوو، هەرچەندە سنووردار بوو، بەڵام شتێکی زۆر بنەڕەتی وپێویست بوو، کە پەیوەست بوو بە باری ئابووری خێزانەکان، دەبوایە پیاوەکە بڕێك پارە بداتە باوکی کچەکە، بۆ پیاوەکە هەبوو کەوا ئەو بڕە پارەیە داوا بکاتەوە لە هەندێ کاتی دیاری کراو، وەك ئەوەی ئافرەتەکە نەزۆك بێت. [2] ئافرەت بۆ خۆی خاوەنی سامانی خۆی بوو، هەقی خۆی هەبوو لە چۆنیەتی خەرج کردنی. هەرچەندە لە شارستانیەتەکانی تری نزیك ودوور، ئافرەت هیچ مافی خاوەنیەتی سامانی نەبوو، هەمووی لە ژێر دەستی پیاودا بوو.

**سێیەم: ئاهەنگ گێڕان (الزفـاف)**

ئاهەنگ سازدەدرا بە گوێرەی هەندێ لە بنەمای کەش وهەوای ئاینی، پیاوی ئاینی دەستی دەکرد بە ئامۆژگاری هەردوو هاوسەرەکە کاتی خوتبەو مارەبڕین، دوایی هەندێ ویردو پاڕانەوە دەگووترا، هەندێ دەنکە گەنم بەسەر هەردوو هاوسەردا بڵاودەکرایەوە. لەکۆتایدا هەردووکیان سێ جار بە دەوری ئاگردانێك دەسووڕان وقاچی

---

1 ــ معـن خليـل عمر، علم اجتمــاع الأســرة، ص54.

2 ــ كريستنسن،ايران في عهد الساسانيين،ص315. عبد الهادي عباس،المرأة والأسرة، 282/1.

خۆیان دەهاویشتە ناو مەنجەڵێك ئاو، پاشان قاپێك لە برنجیان لە نێوانی خۆیان بەش دەكرد، كاتی هاتنی ئێوارە هەردووكیان دەستیان دەخستە ناو دەستی یەكتری وسەیری داری چناریان دەكرد (كە نیشانەی ئاینی زەرادەشت بوو)، ئەو دارەش وەك پاسەوانی دەرگای ماڵیانەو سەیر كردنیان لە لایەن هاوسەرەكان لە ئاینی زەرادەشت بریتی بوو لە گیانی زیندوو، كە لقەكانی بۆ ئاسمان ڕۆیشتووەو ڕەگەكەشی بۆ ناخی زەوی.[1]

**چوارەم: تەلاق – دابڕان (الطلاق)**

تەلاق زۆر كەم ڕوویداوە، چونكە بوخیانەت دادەنرا، تەنها لە چوار باردا، كە بەخیانەت دادەنرا نەبێت: خیانەتی ئافرەت وزینا كردن (الزنى)، كاتێ ئافرەت شاردنەوەی پاككبوونەوەی مانگانەی خۆی لە پیاو بشاردرایەوە، هاتو جۆی لای ساحر بۆ سیحر كردن، ئەگەر نەزۆك بوو. ئەگەر پیاو هاوسەرەكەی تەلاقدا ئەوا ئەو پارەی لێی وەرگرتبوو پێویستە بیگێڕێتەوە بۆ ئافرەتەكە، ئەگەر ئافرەتەكە تەلاقدرا بە ئارەزووی خۆی ئەوا ئەو پارەی كاتی مارەیی پێی دراوە ئەوا پێویستە بیگێڕێتەوە بۆ پیاوەكە. ئەگەر پیاو هاوسەرەكەی تەلاقدا بەڵام ئەو مافەی پێنەدا كەوا بە ئارەزووی خۆی هەڵسوكەوت بكات، ئەوا كاتێ ئەو ئافرەتە مێردی دووەم دەكاتەوە ئەوا ئەو منداڵانەی لە پیاوی دووەم دەبێت، دەبێ بگێڕدرێنەوە بۆ پیاوی یەكەم.[2]

**پێنجەم: جۆرەكانی هاوسەر (أنواع الزوجات)**

**أ ـ خێزانی نایاب (الزوجه الممتازه)**

ئەوە هاوسەری سەرەكی پیاوەكەیە، كە بریتین لە ئافرەتی ئازادوە، بەپێی ئەو داب ونەریت ومەرجانەی باسمان كردن دەبێتە هاوسەری پیاوەكە. لە بنەمای

1 ـ عبد الهادي عباس ، المرأة والأسرة، 281/1. كريستنسن ، إيران في عهد الساسانيين، ص315. عبد الهادي عباس ، المرأة والأسرة، 281/1.
2 ـ عبد الهادى عباس ، المرأة والأسرة، 282/1.

خێزانداری چەند ژنی هەبووە، ڕادەوەستا لەسەر باری ئابووری پیاوەکە، لە ناو خێزاندا پیاو سالاری ماڵ بووە. خێزانی نایاب هەموو پێداویستی لەسەر پیاوەکە بووە بەتایبەتی خواردن وجل وبەرگی. ئەگەر پیاوەکە چەند ژنی هەبووایە لەو جۆرە، ئەوا بۆ هەریەکیان دەبوایە خانووی تایبەتی بکردایە.

ئەگەر پیاوەکە بکەوتایە ناو تەنگژەیەکی ئابووری (کە بە خواست وکەمتەرخەمی ئەو نەبوو)، ئەوا بۆی هەبوو دەست لە یەکێك لە خێزانەکانی بەربدات هەرچەندە لە جۆری نایابیش بوایە. ئەو منداڵانەی لەو ئافرەتە لە دایك دەبوون لە پیاوی دووەم ئەوا هەر لەسەر ناوی پیاوی یەکەم دەمایەوە، هەروەها بۆ پیاوی دووەم نەبوو دەست بخاتە ناو سامانی ئەو ئافرەتەی کە بە کاتی هێناریەتی.[1]

ب- خێزانی خزمەتکار (الزوجة الخادمة)

بریتیە لە هاوسەرێتی کردنی کەنیزەو ئەوانەی لە جەنگەوە گیراون. ئەوانە ئافرەتی پلەی دووەمن، تەنها کوڕەکانی لەو ئافرەتانە دەبوون دەخرانە سەر ناوی خێزان وبنەماڵەکە، کاتی دابڕان وتەلاق بۆی نەبوو هیچ مافێکی ماددی داوا بکات.[2]

ج- ژن هێنانی لە جێ گۆڕکێ (زواج الإبدال)

ئەگەر پیاوێك مردوو کوڕی لەدوا جێ نەما، ئەوا ژنەکەی مارە دەکران لە نزیکترین خزمێکی بەناوی مردووەکە، ئەگەر مردووەکە ژنی نەمابوو بەلام کچی هەبوو ئەوا بەهەمان شێوە کچەکەی شوو دەکات بە خزمێکی، ئەو کچە هەر منداڵێکی بوو ئەوا بەناوی باوکی کچەکە دەکرێت تاوەکو وجاغی کوێر نەبێت، ئەگەر کچی نەبوو ئەوا ئافرەتێکی زۆر نزیکی دەبێت ئەو جۆرە شووە بکات. ئەگەر هیچ ئافرەتێکیان دەست نەکەوتایە ئەوا بە سامانی پیاوە مردووەکە ئافرەتێکیان بۆ خزمێکی دەهێنا تاوەکو منداڵەکانی بە ناوی ئەو بێت. هەر کەسێك یان بنەماڵەیەك ئەو کارە نەکات ئەوا وەك

1 ــ کریستینسین، إیران في عهد الساسانیین، ص316.

2ــ المصدر نفسه، کریستنسن، ص309.

ئەوەیە ژمارەیەکی زۆری لە گیانی بێ تاوانی کوشتبێ، چونکە بووەتە هۆی پچڕانی نەوەی مردووەکە. بڕیاری ئەوەشیان داوە کەوا بنەماڵەی پیاو ماقوڵان وپاشاو ئەمیرەکان ئەو جۆرە هاوسەریەتیە بکەن لەگەڵ بنەماڵەی ئاستی خۆی، نەوەك لەگەڵ ئاستی نزمتر.[1]

د- هاوسەرێتی لەگەڵ مەحرەم (الزواج من المحارم)

ووتراوە ئەوە داب ونەریتێکی کۆنە لەناو فارسەکان، بەفارسی ناوی (خویذ وکدس)، لە ئاڤێستاش هاتووە بە ناوی (خویت ودثە). هەروەها ووتراوە ئەو جۆرە هاوسەرێتیەی نێوان خوشك وبرا ڕووناك کراوەتەوە بە نوری خوداوەند و شەیتان تیایدا دەرکراوەو هۆکاری لابردنی سزای گوناهە گەورەکانە.

بەلام زۆربەی ئەوانەی بەناوی پیرسیەکان قسەدەکەن دەڵێن: ئەو جۆرە هاوسەرێتیە هیچ بنەمایەکی نیەو دوورە لە ڕاستی، بە تایبەتی کاتی ئاینی زەرادەشتی، تەنها جۆرە زیادە ڕەویەکە (اللغو)و هەڵبەستەیە بەرامبەر ئاینی زەرادەشت گووتراوە.

مێژوو نووس (بلسارا) دەڵێ: دەستەواژەی ( خویذ وکدس) بەواتای پەیوەندی نێوان خواوەندو ئادەمیزاد دێت، کە پەیوەندیەکی روحیە لە ڕێگەی ژیانێکی پیرۆزەوە بە دەست دێت. هەروەها دەڵێ: لە سەردەمی پەهلەویەکان ئەو دەستەواژەیە هاتە ناو کتێبەکان، کە لە بنەڕەتدا بریتیە لە بیرۆکەی شیوعیەکانی وەك مەزدەك، نەوەك لە خودی ئاینی زەرادەشتیەوە بێت .[2]

## شەشەم: میرات (المیراث)

خێزانی ناپاب ومنداڵەکان لە میراتدا یەکسان بوون، بەلام ئەگەر کچەکانی شوویان کردبایە ئەوا نیوەی ئەوانی تریان وەردەگرت کە شوویان نەکردووە. خێزانی

---

1 ــ کریستینسین، ص317.

2ــ کریستینسین، ص310. لە لاپەڕەکانی داهاتوو باسی بیرۆکەی مەزدەکی دەکەین.

خزمەتکارو منداڵەکانی مافی میراتیان نەبوو، تەنها باوك دەیتوانی پێش مردن شتێکیان بۆ بڕیار بدات وەك (هیبەو وەصیەت). چاودێریکار هەبووە کاتی دابەش کردنی میرات بە پێی یاسای تایبەت وبەئامادەبوونی پیاوی ئاینی (الموابـذة). ئەگەر مردووەکە هیچی لەدوا بە جێنەمابوو ئەوا کەس وکاری خەرجی جەنازەو ناشتن و چاودێری منداڵەکانیان دەکرد.[1]

## بڕگەی حەوتەم: سزاکان (العقوبات في عهد زرادشت)

ئەگەر پیاوەکە بۆی دەرکەوت کەوا هاوسەرەکەی خیانەتی لەگەڵدا کردووە، ئەوا تەنها ڕێگە لە پێش ئافرەتەکە ئەوەیە کەوا خۆی بکوژێت (الانتحـار). لە سەردەمی ساسانیەکان ئەو سزایە هەندێك سووك کرا، بەوەی ئەگەر بۆ جاریێ یەکەم بوو ئەوا تەنها بەند دەکرێت بۆ ماوەیەك، ئەگەر دووبارەی کردەوە ئەوا هیچ چاری نیە تەنها خۆ کوشتن وئینتحار نەبێت.[2]

لەو بابەتانەی کە باسمان کردن بۆمان دەردەکەوێت کەوا ئاینی زەرادەشتی نەیتوانیوە مافی ئافرەت بدات بە شێوەیەکی ڕاست ودروست، بە تایبەتی لە بابەتی ژن هێنانی لە جێ گۆڕکێ، نارێکی لە دابەش کردنی میرات، دەست لێبەردانی کاتی برسیەتی وتەنگژەی ئابووری ....هتد.

لەگەڵ ئەو کەم وکورتیانشدا دەبینین زۆر یاسای گونجاوی تیابووە کە ڕێزی لە ئافرەت ناوە کە زۆر باشترو چاکتر بووە لە یاسای شارستانیەتەکانی تری ئەوکات و ئاینە دروینەکانی دەست کردی کۆن ونوێ.

ئەگەر بە وردی سەیری ئەو بنەما هەرزی و کرداریـیەی ئاینی زەرادەشت بکەین پێش دەستکاری کردنی، دەبینین زۆر نزیکە لە بیروباوەڕی یەکتا پەرستی (خوا پەرستی)، خووڕەوشتی جوان، ئەنجامدانی ئەرکەکانی ناو هەموو ئاینەکانی تری خوایی، هەر لە سەردەمی ئادەم پێغەمبەر باوکی مرۆڤایەتی و تاوەکو کۆتایین

1 ــ کریستینسن، ص318.

2ــ محمد الحسون وأم علي مشكور، إعلام النساء المؤمنات، ص20.

پێغەمبەر موحەمەدﷺ ، بەڵام هەر دەبوایە ئەو گۆڕانکاریانەی تیایدا ڕوودایە، چونکە ئادەمیزاد هەرچەندە خواپەرستیش بێت زۆر جار ناتوانێ بەرگەی ئارەزوو وتەوژمەکانی ماددی بگرێت، بۆیە دەست دەکات بە دابەزین لە بیروباوەڕ بۆ داهێنانی شتی زیاد ولابردنی هەندێکی تر. ئەو گۆڕانکاریانەش لە هەموو شەریعەتەکان ڕوویداوە، تەنها لە ئاینی ئیسلام نەبێت، چونکە ئاینی کۆتاییەو موعجزەیەکی زمانی وزانستیە، لەلایەن خوای گەورەوە پەیمانی پاراستنی دراوە.

خاڵێکی گرنگیش هەیە پێویستی بە ڕوونکردنەوە هەیە ئەویش ئەوەیە: ئاینی سەرەکی لای خوا بریتیە لە(ئیسلام) واتە ملکەچی بۆ خواو بەندایەتی کردنی، واتە تەسلیم بوون بۆ خوا لە هەموو فەرمانەکانی، کە ئەوکات شوێن کەوتوان ناودەبردرێن بە موسڵمان، پێویستە باوەڕ بە هەموو پێغەمبەرەکانیش بهێنن وجیاوازیش نەکەن لە نێوانیان وبڵێن ئێمەش موسڵمانین، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ﴾البقرة: 136، بەڵام ئەوەی جیاوازە لە نێوانیان ئەوەیە هەر پێغەمبەرێك بەرنامەیەکی تایبەتی هێناوە لەلایەن خواوە بۆ نەتەوەیەك یان زیاتر، کە گونجاوە لەگەڵ کات وشوێن وسەردەمی هاتنی ئەو پێغەمبەرە، هەروەك خوای گەورە دەفەرمویێ: ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ۚ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُمْ ۖ فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ ۚ إِلَى اللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾المائدة: 48.

بۆیە ئاین هەریەك ئاینە (کە ئیسلامە) هەر لە ئادەم تاوەکو خاتەم کە موحەمەدەﷺ، بەڵام شەریعەتی هەریەك لەو پێغەمبەرانە جیاوازن، یان تەواوکەری یەکترین، یان لەوی بالادەسترو تێروتەسەل ترە.

## بەندی سێیەم: بیرۆکەی مانەوی ومەزدەکی

### برگەی یەکەم: بیرۆکەی مانەوی (المـانوية)

داهێنەری ئەو بیرۆکەیە ناوی مانی کوڕی فاتکی حەکیمە، دەرکەوت لە ساڵی 215 زاینی، بانگەوازی پێغەمبەرێتی کرد، پاش ماوەیەك واتە لە ساڵی 245 زاینی بە ئاشکرا بانگەوازی بۆ بیروباوەڕی خۆی کرد، کە دەکاتە سەردەمی فەرمانڕەوایی پاشا سابوری کوڕی ئەردەشیر. بیروباوەڕەکەی بریتی بوو لە ئاینێك لە نێوان مەسیحیەت و مەجوسی. بۆ یەکەم جار لە ناوچەی هەمەدانی ئێران دەستی کرد بە بانگەواز کردن، دوایی گەیشتە بابل و سوریەو فەلەستین.[1]

بانگەوازی ئەو پیاوە بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو شەپۆلە بەدڕەوشتیە، ئەو فەسادە کۆمەلایەتیە بوو کە بڵاوبوونەوە لە ناو کۆمەڵگە، ئەویش لە ئەنجامی دوور کەوتنەوە لە پەیمانی زەرادەشت وکەوتنە شوێن هەواو ئارەزووی جینسی بەربڵاو کە سەری هەڵدابوو. بنەماکانی پەیمانەکەی بریتی بوو لەوەی کەوا خوای گەورە یەکەم جار زانست وحیکمەتی بۆ مرۆڤایەتی نارد، پاشان ئادەمی نارد وەك باوکی ئادەمیزادان، دوایی ئەو پێغەمبەر شیت، نوح، ئیبراهیم، دوای ئەو پێغەمبەر (بەرەدە)ی بۆ هیندیەکان، زەرادەشت بۆ ناوچەی فارس، مەسیح بۆ ڕۆم وڕۆژئاواییەکان، موحەمەدی ﷺ کۆتا پێغەمبەریش بۆ عەرەبەکان. بەلام باوەڕی بە موسی پێغەمبەر نەبوو ؑ.[2]

حەسەن نەدەوی لە کتێبی (ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين) دەڵێ: مانی لە سەدەی سێیەمی زاینی دەرکەوت، لە ئەنجامی ئەو تەوژمە بەد ڕەوشتی وفەسادەی لە وولات بڵاوبۆوە. ئەو بیرۆکە نادروستە بانگەشەی بۆ ئەوە دەکرد کەوا دەبێ ڕووناکی وتاریکی تێکەڵ بێت، بۆیە بە ئاشکرا ئەی ووت دەبێ خەڵکان ڕوو بکەنە ڕەبەنیایەتی

---

1 ــ بيرنيا حسن ، تاريخ إيران القديم، ص309. الشهرستاني، للملل والنحل، ص198.
2 ــ بيرنيا حسن، تاريخ إيران القديم، ص309.

و ژن نەهێنان تاوەكو كەس نامینێ لەسەر زەوی، پەلە بە كۆتایی هاتنی بوونەوەر بدرێت. بە ڕێگە گرتن لە منداڵبوون وبنبڕكردنی نەوەكان، ئەو كات ڕوناكی بەسەر تاریكیدا زاڵ دەبێت.[1]

لە ساڵی276 زاینی كوژرا، بە فەرمانی بەهرام فەرمانڕەوای ئێران، چونكە گووتی: بانگەشەی ئەو پیاوە بۆ ئەوەیە هەموو جیهان بێتە كاولگە ونەمێنێ، بۆیە پێشەكی پێویستە خۆی نەمێنێ تاوەكو ئەو ئاواتەی هەیبوو بێتە دی.

## بڕگەی دووەم: بیروكەی مەزدەكی (المَزْدَكِيَّة)

ناوی مەزدەك كوڕی بامدادە،[2] خەڵكی ناوچەی نەیسابوورە، لە ساڵی 487 زاینی لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی پاشا قوباد بانگەوازەكەی ئاشكرا كرد، قوبادیش پەیمانی پێدا كە ئەو بیروباوەڕە بكاتە ئاینی ڕەسمی وولات. بنەڕەتی باوەڕەكەیان لەسەر ئەوەیە. كەوا ڕوناكی هەنگاوەكانی بە بەرنامەیە، بەڵام تاریكی هەنگاو دەنێ بە تێكەڵ و پێكەڵی، شەڕو ئاژاوەش زۆری بەهۆی ئافرەت وسامانە، بۆیە پێویستە هەموو خەڵكان لەو دوو شتە هاوبەش بن هەروەك هاوبەشیان لە ئاوو ئاگرو كەلوپەل تاوەكو كێشە لەسەر ئەو دوو شتە دروست نەبێ.[3]

ئیمامی تەبەری دەڵێ: بانگەوازەكەی شوێنكەوتووی زۆری بۆ پەیدا بوو لە نێوان گەنجەكان وئارەزووبازان و بێكارو پیشەكان، بەتایبەتی پاش ئەوەی شا قوباد فەرمانی پاڵپشتی كردنی بۆ دەركرد، لە ئەنجامی ئەوەوە ئێران كەوتە ناو زەلكاوی بەدڕەوشتی وپەرت وبڵاوبوونەوەی سامانی خەڵك ونەمانی خێزان ونەمانی سەرمایەی كاركردن.

---

1 ــ الندوي، ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين، ص39.

2 ــ بيرنيا حسن، تاريخ إيران القديم ، ص320. هــ. ج. ولز ، معالم تاريخ الإنسانية ، 751/2. وابن النديم ، الفهرست، 661/1. الطبري، تاريخ الطبري، 92/2.

3 ــ الشهرستاني، الملل والنحل، ص301. ابن النديم ، الفهرست، ا/ 342. بيرنيا حسن، تاريخ إيران القديم ، ص320.

گەنجە بێ کاروئارەزووبازەکان ئەو بڕیارەی شایان بۆ بەرژەوەندی خۆیان قۆزتەوەو کەوتنە ناو ماڵ وسامانی خەڵك، وای لێهات دەچوونە ماڵی دەوڵەمەندەکان بەئارەزووی خۆیان لەگەڵ ئافرەتەکان ڕایان دەبوارد وسامانێکی زۆریشیان دەبرد بەبێ ئەوەی خاوەن ماڵ بتوانێ بەرگری بکات. کاتێ ئەو کۆمەڵە گەنجە دەسەڵاتیان پەیدا کرد، بە شا قوبادیان ڕاگەیاند گەر ڕێگەیان لێ بگرێت ئەوا لەسەر کورسی فەرمانڕەوایی بەلاوەی دەنێنن، ئەو بارودۆخە بەردەوام بوو تاوەکو وای لێهات خەڵکان منداڵی خۆیان نە دەناسیەوە وکەسیش خاوەنی هیچ شتێکی خۆی نەبوو.[1]

دوای مردنی شا قوباد، شا ئەنوشیروان هاتە سەر کورسی فەرمانڕەوایی، لە نیەت و ئارەزووە گڵاوەکانی ئەو بانگەوازە تێگەیشت، فەرمانی دا بە کوشتنی ئەو بەد ڕەوشتە ساڵی 529 زاینی، زۆربەی شوێنکەوتووەکانیشی گرت وکوشت.[2]

دەرکەوتنی ئاینی مەسیحی لەو ناوچەیە: لە ساڵی 282 زاینی شا نەرسی لەسەر کورسی فەرمانڕەوایەتی ئێراندا بوو، لە ساڵی 297 زاینی شەڕێك بەرپا بوو لە نێوان فارس وڕۆمەکان، لەو شەڕە ڕۆمەکان سەرکەوتن وشا نەرسی خۆشی بریندار بوو، هەڵات تاوەکو دەستگیر نەکرێت، بەڵام زۆر ناوداروپیاوانی بەرزی ئێران گیران.نەرسی نوێنەری نارد بۆ ئاشتی وپەیمان بەستن، ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی ئێران ژمارەیەك لە ویلایەتەکانی ڕۆژئاوای ڕووباری دیجلە بداتە ڕۆمەکان وئەو ڕووبارەش سنووری نێوانیان بێت.[3]

بەم شێوەیە ئاینی مەسیحی لە وڵاتی فارس وناوچە کورد نشینەکان بڵاوبۆوە، تاوەکو ئێستاش لەو ناوچانە هەر ماون.

بە شێوەیەکی گشتی لەسەردەمە جیاجیاکانی فەرمانڕەوایەتی فارسەکان دوای هاتنی زەرادەشت خەڵك ناسرابوون بە پیاوەتی، دەست بڵاوی، هاوکاری کردنی

---

1 ـ للطبري، تاريخ للطبري ىتاريخ الأمم والملوك، 92/2. ابن النديم ، للفهرست، ا/ 342. بيرنيا حسن، تاريخ إيران القديم ، ص320.

2 ـ بيرنيا حسن، تاريخ إيران القديم، ص323.

3 ـ بيرنيا حسن، تاريخ إيران القديم، ص323.

یەکتری، ڕەوشتی جوانی وەك خۆ نواندن بۆ یەکتری کاتی بەیەك گەیشتن، گەورەو بچوکی، سزادانی پیاو و ژن لەسەر بەد ڕەوشتی. دەربارەی زینا ووتویانە: (باشتر وایە ئەوانە بکوژرێن وەك چۆن یەکێك مارو دوپشك وسەگی هار دەکوژێت)، دەربارەی نێربازی ووتویانە:(تاوانێکە لێبووردنی بۆ نیە)[1]

بەڵام لە هەندێ کاتی تایبەت وەك دەرکەوتنی مەزدەکیەکان بەد ڕوشتی زۆر بڵاو بۆوە، وای کرد ووڵات نەتوانێ چیتر بەرامبەر ڕۆمەکان بوەستێ وبەرەو کزی ولاوازی بڕوات.

1 ــ بیرنیا حسن، تاریخ إیران القدیم، ص323.

# باسی دووەم

# ئافرەت لە شارستانیەتی بابلی دا

**بەندی یەکەم: پەیوەندی خێزانداری**

**بڕگەی یەکەم: هاوسەرێتی**

**بڕگەی دووەم: مارەیی**

**بڕگەی سێیەم: دیاری هاوسەرێتی**

**بڕگەی چوارەم: مارە بڕینی کەنیزە**

**بەندی دووەم: سزاکان**

## باسی دووەم: ئافرەت لە شارستانیەتی بابلی دا

### یاساکانی حامورابی پەیوەست بە باری کەسایەتی

کاتی تێدەڕوانین دەبینین لە هەندێ ڕووەوە لەیەکچوون ونزیکی هەیە لە نێوان یاساکانی هاتوو لە ئاڤێستاو هەندێ لە یاساکانی شارستانیەتی بابلی لە سەردەمی (حامورابی)،[1] ئەوەش بە هۆی چوونە ناویەکی شارستانیەتەکان بووە لەکاتی شەڕو داگیرکردن، کاروباری بازرگانی، بەتایبەتی نزیك بوونەوەی بابلی ومیدیەکان بۆ دژایەتی کردنی ئاشووریەکان و لەناو بردنیان. بەڵام زەرادەشتی زۆر پێشکەوتوو تربووە لە یاساکانی بابلی، چونکە لەوانەیە زەردەشت پێغەمبەر بوونی، چەند سەدەیەك لەدوای بابلیەکان بووبێ، یاساکانی ئاسمانیش بە گوێرەی کات وسەردەم و ناوچە بووە، تەنها ئاینی ئیسلام نەبێ بۆ هەموو کات وشوێن وسەردەمەکان بووە ودەمێنێ تاوەکو ڕۆژی دوایی.

#### بەندی یەکەم: پەیوەندی خێزانداری (العائلة)

##### برگەی یەکەم: هاوسەرێتی

لەو سەردەمە باوك سالاری موتلەق بوو، گەیشتبووە ئاستی بەندایەتی کردنی ئەندامانی تری خێزانەکە.

ئەو بەندانەی پەیوەستن بە باری کەسایەتی ئاماژە بەوە دەکەن کەوا کاتی پێکەوەنانی ژیانی هاوسەرێتی گرێبەندی ڕەسمی بە نووسراو هەبووە.[2]

---

1 ــ الحمورابي: گەورەترین پاشاکانی بابلی بووە، لەسالی 1792–1750 پێش زانینی فەرمانڕەوایی کردووە(42 سال)، توانی هەموو میرنشینە بچوکەکان یەکبخات وناوی ڕابیدەین بکاتە یەك پارچە. داهێنەری دەستووری بابلیە، کە لە 285 بەند پێکهاتووە. ئەو دەستوورە لە سالی 1902 لە شاری شوش دۆزراوەتەوە، دوایی بردرا بۆ مۆزەخانەی لۆڤەر لە پاریس. المنجد في الأعلام، ص 225.

2 ــ رضا جواد، نظم العائلة البابلي القديم، ص36.

لەو گرێبەندیە ئەرك وفەرمان ومافی هەردوولا دیاری کرابوو، ئەو دەستە واژەی تیایە کە بە ئاشکرا دەڵێ: ئەوا ئەو دوو کەسە (ژن وپیاو)ەکە بوونە هاوسەری یەکتری، واتە بوونە ( ژن ومێرد – الزوج والزوجة).

**هەندێك لە بەندەکانی یاسای حامورابی:**

1- ماددەی 138: ئەو ئافرەتەی لە کاتی بوونی لە ماڵی مێردی دەبوایە پیاوەکەی بچێتە لای، ئەگەر نەچووایە لای ئەوا هەرگیز بە خێزانی هەژمار نەدەکرا هەرچەندە یەك ساڵیش لە ماڵی بمایەوە.

2- ماددەی 128: ئەگەر پیاوێك هاوسەرێکی بۆ خۆی بڕیاردا بەبێ گرێبەندی ڕەسمی نووسراو ئەوا ئەو ئافرەتە بە خێزانی پیاوەکە هەژمار ناکرێ.[1]

## بڕگەی دووەم: مارەیی

بڕێك لە پارە، یان ژمارەیەك لە ئاژەڵ، یان هەندێ کەلوپەل، یان خشل وزێر، دەدرێتە ئافرەتەکەوە لەلایەن باوکی کچەکە کاتی شووکردن، لە گرێبەندیەکە دەنووسرێ، ئەوەش لە بری میراتی باوکیەتی، هەروەها وەك مارەیەکیشە، دوای مردنی بۆ منداڵەکانی ئەو ژنە دەمێنێتەوە.[2]

## بڕگەی سێیەم: دیاری هاوسەرێتی (هدیة الزواج- ترخام)

ئەو بڕە پارەیەیە، یان کەلوپەلی ترە کە پیاوەکە پێشکەشی ئافرەتەکەی دەکات، یان باوکی کوڕەکە پێشکەشی باوکی کچەکەی دەکات پاش تەواوبوونی گفتوگۆی نێوانیان. ئەوەش مەرجێکی سەرەکیە لە گرێبەندیەکە، بۆ مێردەکەش نیە ئەو پارەیە بۆ خۆی بەرێت تەنها لە یەك باردا نەبێت ئەویش ئەگەر ئافرەتەکە منداڵی نەبوو (نەزۆك بوو).[3]

---

1 ــ رضا جواد، نظم العائلة البابلي القديم، ص200.
2 ــ رضا جواد، نظم العائلة البابلي القديم، ص64.
3 ــ رضا جواد، نظم العائلة البابلي القديم، ص70 .

### بڕگەی چوارەم: مارە بڕینی کەنیزە (زواج الإماء)

کەنیزەکان بە نزمترین چینەکانی کۆمەڵگە دەژمێردران، هەروەك ئاژەل وکەلوپەل مامەڵەیان لەگەڵ دەکرا، خاوەنەکەی مافی ئەوەی هەبوو هەموو جۆرە هەڵسوکەوتێکی لەگەڵدا بکات لە هەموو کاتێکدا، بۆی هەبوو بچێتە لای یان بیفرۆشێ بەکێکی تر، یان بیداتە کوڕەکانی بەبێ دیاری کردنی مارەیی، یان دیاری هاوسەرێتی. وا دەردەکەوێت مامەڵەکردن لەگەڵ بەندەکان (کوڕو کچ) لە هەموو شارستانیەتەکان وکۆمەڵگەکانی کۆن هەروەك یەك بووە.

### بەندی دووەم: سزاکان

پێویستە لەسەر ئافرەت کەوا پارێزگاری داوێن پاکی وهەڵسوکەوت وشەرەف وناموسی خۆی بکات لە کاتی بوونی لە ماڵی هاوسەرەکەی. ئەگەر ئافرەتێکیان ببینیایە لە باری پاڵکەوتن یان جووتبوون لەگەڵ پیاوێکی بێگانە ئەوا بە زیندوویی فڕێ دەدرا ناو ڕووبار، ئەگەر مێردەکەی لێبووردنی بکردایە ئەوا پلەی دادەبەزی بۆ پلەی کەنیزەو هیچ مافێکی نەدەما.[1]

هەروەك لە ماددەی 129 هاتووە: ئەگەر ئافرەتێك ببینرا لە باری پاڵکەوتن یان جووتبوون لەگەڵ پیاوێکی بێگانە ئەوا هەردووکیان پەل بەند بکەن پێکەوەو بەزیندوویی فڕێیان بدەنە ناو ئاو.[2]

---

1 ــ رضا جواد، نظم العائلة البابلي القديم، ص201.

2 ــ رضا جواد، نظم العائلة البابلي القديم، ص201.

# بەشی دووەم

## ئافرەت لە ئاین وکۆمەڵگەکانی تری پێش ئیسلامدا

بەندی یەکەم: ئافرەت لە ئاینی یەهودیدا

بەندی دووەم: ئافرەت لە تەلموددا

بەندی سێیەم: ئافرەت لە ئاینی مەسیحیدا

بەندی چوارەم: ئافرەت لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا

بەندی پێنجەم: ئافرەت لە یۆنانی کۆندا

بەندی شەشەم: ئافرەت لە ناو هیندۆسیەکاندا

بەندی حەوتەم: ئافرەت لەناو بوزیەکاندا

بەندی هەشتەم: ئافرەت لە ڕێساکانی هندیەکاندا

## بەندی یەکەم: ئافرەت لە ئاینی یەهودی (المرأة عند اليهود)

یەهودیەکان ئافرەت تاوانبار دەکەن بەوەی کە هۆکار بووە بۆ دەرکردنی ئادەم ﷺ لە ناو بەهەشت، کاتێ کە خوای گەورە خواردنی دارەکەی لێ قەدەغە کردن ئیبلیس لەسەر شێوەی مارێك هاتە ناو بەهەشت وحەوای تەفرەداو لە دارەکەی خوارد، دوایی ئادەم ﷺ دەستی بە خواردنی دارەکە کرد، هەر لەبەر ئەو هۆیەش بوو خوای گەورە لە بەهەشت دەریکردن وناردنیە سەر زەوی. ئا بەم شێوەیە یەهودیەکان ئافرەت تاوانبار دەکەن. پاش ئەوەی ئادەم ﷺ لە دارەکەی خوارد، خوای گەورە فەرمووی ئەی ئادەم بۆچی لەو دارەت خوارد کە لێم قەدەغە کردبوو؟ ئەویش فەرمووی ئەو ئافرەتەی کە لەگەڵ منت دانابوو ئەو هانی دام وبەرهەمی دارەکەی بۆ هێناوم ومنیش خواردم. خوا بە ئافرەتەکەی ووت: منیش شەکەتی وماندوو بوونت زیاد دەکەم لەگەڵ سك پڕی، بە نارەحەتیش منداڵتان دەبێت، ئارەزووشت دەبێ بۆ پیاو بروات وئەویش سالاری تۆ بکات.[1]

ژن هێنانیش لای یەهودیەکان وەك مامەلەیەکی کڕین وفرۆشتن بووە، کچەکە لە باوکی دەکڕدرێ و هاوسەرەکەی دەبێتە سالاری موتلەقی ئافرەتەکە. ئافرەتی بە شوودراویش وەك منداڵ وکەم ئەندام وشێت و بێ هۆش تەماشا دەکرێت، بۆ ئافرەت نیە کڕین وفرۆشتن بۆ خۆی بکات، هەموو سامان وکەلوپەلی ئافرەت، هەروەها هەموو ئەو سامانەی لە کارکردن پەیدای دەکات، یان ئەو سامانەی لە کاتی زەماوەنددا بە دیاری بۆی دێت مولکی پیاوەکەیە، لە کاتی مردنی مێردەکەی میراتی بۆ نیە، لە کاتی بێ نوێژیدا بە ئادەمیزادێکی پیسی لەقەلەم دەدەن وخواردنی لەگەڵ ناخۆن، مێردەکەشی لەگەڵی ناخەوێت.[2]

---

1ـ الكتاب المقدس-كتب الشريعة الخمسة، 1986. سفر التكوين 3/1-16 امتحان الحرية والذلة، ص73.

2 ـ الشلبي، أحمد، مقارنة الأديان، 2/301.

سەرنجی ئەو خاڵانە بدەن لە شەریعەتی یەهودی، کە تاوەکو ئێستا پەیڕەو دەکرێت لای جولەکەکان، دوایی بەراوردی بکەن لەگەڵ ئاینی ئیسلام، تاوەکو خۆتان بڕیار بدەن ئایا کام لەو شەریعەتانە ئاستی بەرزە، کامەیان مافی ئافرەتی دابین کردووە؟

## بەندی دووەم: ئافرەت لە تەلمود (المرأة في التلمود)

لە تەلمودا لەسەر زاری موسی ﷺ دا هاتووە: ئارەزووت بۆ ئافرەتی نزیکی خۆت نەچێت، هەر کەسێك زینای لەگەڵ ئافرەتی نزیك خۆی بکات کوشتنی لەسەرە. (ئافرەتی نزیك: لە تەلمۆد تەنها مەبەستی ئافرەتی جولەکەیە) چونکە لای ئەوان زینا لەگەڵ ئافرەتی تر جائیزە.

حاخامەکان بە تایبەتی (موشـــی) لەو ووتەیەی تەلمود ئەوەیان هەڵێنجاوەو دەرهێناوە کەوا هەر یەهودیەك ئەگەر زینای کرد لەگەڵ ئافرەتێکی تر کە جولەکە نەبێ ئەوا هەڵەی نەکردووە ئەویش لەبەر دوو هۆ، یەکەمیان: لای ئەوان هەموو نیکاحەکانی ئاینەکانی تر بەتاڵە جگە لە نیکاحی بوو لە یەهودیەکان، دووەمیان: ئەو ئافرەتەی لەوان نەبێت وەك ئاژەڵ سەیر دەکرێن، گرێبەستی بوو لە ژن هێنانیش لەگەڵ ئاژەل ناکرێت.

(بشای ولـین وجرسـوف)ئەو سێ حاخامە یەهودیانە، لەگەڵ ئەو ڕایە دان دووبارەیان کردۆتەوەو کردوویانە بە یاسا، کەوا هەر یەکێکی یەهودی زینا بکات لەگەڵ بێ باوەڕان (مەبەستیان مەسیحیەکانە) ئەوا بە تاوان دانانرێ. هەروەها حاخام میمانود دەڵێ: یەهودی مافی ئەوەی هەیە بەزۆر زینا بکات لەگەڵ ئافرەتانی بێ باوەڕ (واتە جگە لە جولەکە).[1]

لێرەوە نەتەوەگەری و ڕەگەزپەرستی وجیاوازی چینایەتی جولەکەکانمان بۆ دەردەکەوێت، هەروەها بەکەم سەیرکردنی خەڵکانی تر وەك مەسیحیەکان، هەرچەندە

1ـ الشلبي، مقارنة الأديان، 270/2.

مەسیحیەکان بەردەوام لە خزمەتی ئەوانن. بەڵام ئاینی ئیسلام خەڵکان یەکسان دەکات بەوەی هەموویان لە ئادەم هاتوونەتە دونیاوەو ئادەمیش لە خۆڵە، تەنها جیاوازی لە نێوانیان پلەی بەندایەتی وتەقوایە، لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزیش جیاوازی چینایەتی بەلاوەدەنێ.

## بەندی سێیەم: ئافرەت لە ئاینی مەسیحیدا (المرأة في الديانة المسيحية)

پەیمانی نوێ (ئینجیل) داوای ئەوە دەکات کەوا نەوەی ئادەمیزاد نەمینێ، بەهۆی خەساندن ونەزۆك کردنی نێرینە، هەروەك عیسیﷺ دەڵێ: نێرینە کە لە دایك دەبێ جووتە گونی هەیە، خواش فەرمانی کردووە بە ڕەبەنی ونەزۆکی، هەیە ڕەبەنی وخەساندنی کردووە لە پێناوی خاوەنی ئاسمانەکان، هەر کەسێك دەتوانێ ئەو کارە بکات با بیکات.[1]

لە دەستووری مەسیحیەکان دەربارەی خێزانداری هاتووە: لەسەر هەموو پیاوو ژنان پێویستە ژیانی ڕەبەنی هەڵبژێرن، بەڵام چونکە ئەو شتە ناتوانرێ جێبەجێ بکرێت بۆیە ژن هێنان دانراوە. هەندێ جاریش لەترسی زیناکردن ژن هێنانیان داناوە. هەروەها تەڵاق نیە تەنها لە کاتی زینا نەبێ، هەرکاتێ ئافرەت تەڵاقدرا بەهۆی زینا ئەوا نە پیاوەکە دەتوانێ ژنی دووەم بهێنێ، نە ئافرەتەکەش دەتوانێ شوو بکاتەوە.[2]

ئەو یاساو دەستوورە دوور لە واقیعیانە لە شەریعەتە گۆڕدراوەکەی مەسیحیدا بەدی دەکرێت، بۆیە بەدڕەوشتی وزینا زۆر بووە لە کۆمەڵگەکانی ڕۆژئاوا.

هەموو ئەو گوتانەی بەناوی موسی و عیسی پێغەمبەرﷺ گوتراوە هیچی بنەمای ڕاست و دروستی نیە، چونکە تەورات و ئینجیل دوای ئەوان گۆڕانکای تەواوی بەسەردا هاتون.

---

1 ــ الشلبي، مقارنة الأديان، 270/2.

2 ــ الشلبي، مقارنة الأديان، 236/2 .

## بەندی چوارەم: ئافرەت لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا

لە دەستوورەکانی ڕۆمانی، ئافرەت تەنها شوێن کەوتەی پیاوان بووەو هەروەك یەکێکی کەم ئەندام تەماشا دەکرا، هیچ جۆرە مافێکی نەبووە. لەکاتی بەشوودانیدا، ئەو گرێبەندیەی دەکرا لە نێوان پیاوو ژن ناوی (پەیمانی سالاری) بوو، واتە پیاوەکە گەورەو دەسەلاتدارە بەتەنها.[1]

لە کۆبونەوەیەکی گەورە لە ڕوما بەسترا وبڕیار درا کەوا ئافرەت بوونەوەرێکی بێ نەفس وگیانە، لە ڕۆژی دوایی هیچ پاداشتی نیە. ئافرەت پیسە، نابێ گۆشت بخوات، نابێ پێبکەنێ، بۆی نیە قسە بکات. لە هەندێ کات وسەردەمدا تاوەکو قەدەغەی قسە کردنی لێ بکەن، دەمیان بە( قوفڵ) وکلیل دەبەستەوە. ئافرەتانی خانەوادە بەرزو نزمەکان هەروەك یەك بوون لە کاتی دەرچوونیان بۆ دەرەوە قوفلێکیان بەسەر دەمەوە بوو. هەروەها ئافرەت بە هۆکارێکی سەرەکی فەساد و بەدڕەوشتی دادەنرا، چونکە وایان هەست دەکرد کەوا شەیتان ئافرەت بۆ پیس کردن وفەسادی دڵەکان بەکار دەهێنێ.[2]

## بەندی پێنجەم: ئافرەت لە یۆنانی کۆندا (المرأة في اليونان القديمة)

ئافرەت لە کالا بێ نرخەکان دەژمێردرا، دەکڕاو دەفرۆشرا لە بازارەکان، هەندێ جاریش بە پیسترین کارەکانی شەیتان ناو دەبردرا.

مستەفا سوباعی دەڵێ: بێبەش کرابوو لە خوێندن، بەشداری نەبوو لە کاروباری کۆمەلایەتی، سەربەستی وئازادی نەبوو لە کارو لە سامان، پیاو بە ئارەزووی خۆی

---

1 ــ شوقي أبو خليل، تحرير المرأة ممن؟ وفيم حريتها؟ ص37. نقلاً عن معروف الدواليبي، تاريخ الحقوق الروماني. ومحمود سلام الزناتي، المرأة عند الرومان.

2 ــ الشلبي، مقارنة الأديان، 216/3.

دەیتوانی لەهەر کاتێکدا تەلاقی بدات، بەلام ئافرەتەکە بۆی نەبوو داوای تەلاق بکات.[1]

عەلی عەبدولواحید الواف دەڵێ: مۆڵەتی خوێندن تەنها دەدرا بە نێرینە ئازادەکانی یۆنان، بەلام هەموو جۆرە خوێندنێك بۆ ئافرەتان دەرگای داخرابوو، هەروەك گەورە فەیلەسوف وزانایان ئەرستۆ لە کتێبی رامیاری (السیاسة) دەڵێ: سروشت هیچ ئامادەکاریەکی هۆش وبیری بە ئافرەت نەداوە تاوەکو شت فێرببێ، بۆیە تەنها پەروەردە بکرێن لەسەر کاروباری ماڵ ومنداڵ لە ئامێزگرتن.[2]

ئەو ئافرەتانەی بە خوایان دانابوون، یەکێکیان ناوی (ئەفرۆدیت) بوو، کە خێزانی یەکێك لە خوایە پیاوەکان بوو، کاتی پەیوەندی خۆشەویستی دروستکرد لەگەڵ پیاوێکی سادەو خیانەتی کرد لەگەڵ خوایەتیەکەی، منداڵێکی بوو ناویان نا(کیوبید)، بووە خوای خۆشەویستی.[3]

## بەندی شەشەم: ئافرەت لە ناو هیندۆسیەکان (المرأة والهندوسية)

ئافرەت هیچ کاتێك ئازاد نەبووە لە کۆمەڵگەی هیندۆسی، لەتەمەنی کچێتی بەتەواوی لە ژێر دەسەلات وئارەزووەکانی باوکیدا بووە، لە دوای شووکردن لە ژێر دەسەلاتی مێردەکەیدا بووە، بێوەژن لە ژێر دەسەلاتی منداڵەکانی بووە. کچ بۆی نەبووە ئەو پیاوەی کە باوکی بۆی دیاری کردووە رەتی بکاتەوە، خزمەتی دەکات تاوەکو لە ژیاندا مابێ، هەرکات مرد دەبێ وازبهێنێ ودوور بکەوێتەوە لە خۆشیەکانی ژیان وەك: خواردنی خۆش وپۆشاکی جوان و خشل وزێر بەکار هێنان، هەروەها دەبێ تاوەکو لە ژیان مابێ نابێ شوو بکاتەوە.[4]

---

1 ــ السباعي، مصطفى المرأة بين الفقه والقانون، ص13.

2 ــ الوافي، علي عبد الواحد، المرأة في الإسلام، ص28.

3ــ شوقي أبو خليل، حرية المرأة ممن؟ ص44 .

4 ــ الوافي، علي عبد الواحد، المرأة في الإسلام ، 4 /77-78.

## بەندی حەوتەم: ئافرەت لەناو بوزیەکاندا (المرأة والبوذية)

ئافرەت گۆشەگیر نەبووە لە سەردەمی بوزا خۆی ، لەگەڵ ئەوەشدا بوزا زۆر جار دوودڵ بووە لەوەی ئافرەتان وەربگریّ یان نا بۆ ناو ئاینەکەی وببن بە شوێنکەوتەی بیروباوەڕەکەی وەك نێرینەکان، چونکە وای گومان دەبرد وەرگرتنی ئافرەتان کاریگەریەکی ترسناکی دەبێ لەسەر کۆمەڵگەی بوزی، هەر بۆیەش جارێك بە کوڕی مامی خۆی (آننیذا) ووت: دوای وەرگرتنی ئافرەتان بۆ ناو ڕیزەکانمان نابینم ئەو کارە زۆر درێژەی بخایەنێ.[1] ئافرەت لە هەر تەمەنێك بێت، بچوك، گەورە، پیر ناتوانێت بە ئارەزوو وسەربەستی خۆی کاربکات هەرچەندە لەناو ماڵی خۆی بێت.[2]

لەسەر ئافرەت پێویستە خزمەتی مێردی خۆی بکات، پیاو وەك خوا سەیر دەکرا، هەرچەندە پیاوەکە زۆر ناپەسەندیش بێت ودۆستایەتی لەگەڵ ئافرەتی تریش هەبێ.[3]

## بەندی هەشتەم: ئافرەت لە ڕێساکانی هندیەکاندا (الشرائع الهندية)

یاساکانی هیندی ئەو دەستەواژانەی زۆر بە ئاشکرا بڕیار دابوو، کەوا نەخۆشی ومردن وجەهەننەم و ژەهری مار لە ئافرەت خێرترو پەسەند ترە. مافی ژیانی ئافرەت تەنها تاوەکو ئەو کاتە بوو کە هاوسەرەکەی لە ژیان بوو، هەر کاتێ کە مێردەکەی مردو تەرمەکەی سووتێنرا، دەبوایە ئەویش خۆی بخاتە ناو ئاگرەکە، ئەگەر نا ئەوا نەفرەتی هەتا هەتایەی دەکەوێتەسەر.[4]

---

1 ـ الوافي، علي عبد الواحد، المرأة في الإسلام ، 4/179-180.
2ـ السمحراني، أسعد ، من قاموس الأديان(الهندوسية والبوذية)، ص48.
3ـ السمحراني، من قاموس الأديان، ص49.
4ـ الشلبي، مقارنة الأديان، 4/216.

# بەشی سێیەم

# ئافرەت لە شارستانیەتی ڕۆژئاوای مەسیحیدا

بەندی یەکەم: ئافرەت لە سەدەکانی ناوەڕاست

بڕگەی یەکەم: ڕای کەنیسەی کاثولیك

بڕگەی دووەم: ئافرەت لە فەرەنسا

بڕگەی سێیەم: ئافرەت لە بەریتانیا لە سەدەی نۆزدەهەم

بەندی دووەم : ئافرەت وشۆڕشی پیشەسازی

بڕگەی یەکەم: شۆڕشی پیشەسازی لە فەرەنسا

بڕگەی یەکەم: شۆڕشی پیشەسازی لە بەریتانیا

بڕگەی سێیەم: لێکدانەوەی باسەکە

بەندی سێیەم: دروست بوونی ڕێکخراوەکانی ئافرەتان

بەندی چوارەم: ئافرەتانی ڕۆژئاوا چ سوودێکیان بەدەست هێنا لەو بانگەوازە؟

## بەشی سێیەم: ئافرەت لە شارستانیەتی ڕۆژئاوای مەسیحیدا

پێش چوونە ناو باسی ئافرەت لە شارستانیەتی ڕۆژئاوادا، باسی تێڕوانینی هەندێ لە پیاوانی ئاینی مەسیحی دەکەین بەرامبەر بە ئافرەت لە سەدەکانی ناوەڕاستدا.

### بەندی یەکەم: ئافرەت لە سەدەکانی ناوەڕاست

#### بڕگەی یەکەم: ڕای کەنیسەی کاثولیک

نووسەرێکی دانمارکی بەناوی (ڤیث کوندسرین) ڕای کەنیسەی کاثولیکی بەرامبەر بە ئافرەت ڕوون دەکاتەوەو دەڵێ: لەبەر ئەوەی ئافرەت بە ئادەمیزادی پلە دوو دادەنرا بۆیە هیچ ڕێزو پلەو پایەیێکی کۆمەڵایەتی نەبوو.[1]

پاپا تیرە دەڵێ: چەند دڵخۆشە ئەو کەسەی خوا کوڕێکی پێدەدات، چەندە بەدبەختە ئەو کەسەی خوا تەنها مێینەی پێدەبەخشێ، هەرچەندە ئافرەت پێویستە بۆ زۆر بوونی منداڵ هەروەك چۆن بازرگانی پێویستە بۆ زۆر بوونی سامان، کەواتە ئافرەت وبازرگانی یەکسانن. پێستەو بۆنی خۆش هەردووکیان بۆ ئادەمیزاد پێویستن، بەڵام نەفسی ئادەمیزاد بەرەو لای بۆنە خۆشەکە دەڕواو ڕوق وکینەی لە پێستە، ئایا دەبێ پێستەو بۆن یەك هەژماریان بۆ بکرێت؟[2] بۆن وپێستەیە: مەبەستی کوڕو کچە.

#### بڕگەی دووەم: ئافرەت لە فەرەنسا

**فەرەنسا پرسیار دەکات: ئایا ئافرەت ئادەمیزادە؟**

لەساڵی 586 زاینی کۆنگرەیەك بەسترا سەبارەت بە ئافرەت، تیایدا ئەو پرسیارە کرا ئایا ئافرەت ئادەمیزادە یان نا؟ پاش گفتو گۆیەکی زۆر بڕیاردرا کەوا ئادەمیزادە، بەڵام بۆ خزمەتی پیاو دروست کراوە.[3]

---

1 ــ أحمد الشلبي، مقارنة الأديان، 218/4.
2 ــ أحمد الشلبي، مقارنة الأديان، 300/3.
3 ــ شوقي أبوخليل، تحرير المرأة ممن، ص 40.

هەر لەوکاتەوە فەرەنسیەکان دانیان نا بەوەی کەوا ئافرەت ئادەمیزادە، چونکە پێشتر گومانیان لەوە بوو کەوا ئافرەت ئادەمیزاد بێت، هەرچەندە پاش ئەوەی بڕیارباندا کەوا ئادەمیزادە، بەڵام بەتەواوی نەیان چەسپاند کەوا ئادەمیزادێکی تەواوە، بەڵکو شوێنکەوتەی پیاوەو بۆ خزمەتی ئەو دروست کراوە. هەر لەبەر ئەو هۆیەش بوو تاوەکو ساڵانی نزیك ئافرەتی فەرەنسی لە بچوکترین ماف بێبەش کرابوو، هەروەك باسی دەکەین لە لاپەڕەکانی داهاتوو.

هەرچەندە شۆڕشی فەرەنسی بانگەوازی ئەوەی کرد کەوا خەڵك ئازادن وبەندایەتی نەما، بەڵام ئافرەتان هەر لەڕیزی کەم عەقڵەکانی وەك شێت ومنداڵ هەژمار دەکرا، تاوەکو ساڵی 1938ز، ئینجا ئەو یاسایە لابردرا.[1]

عەفیف تەببارە دەربارەی ئافرەتی فەرەنسی دەڵێ: یەکێك لە ڕۆژنامەکانی فەرەنسی لە 20 ی شوباتی ساڵی 1938 ز، بڵاوی کردەوە کەوا یاسایەك دەرچوو بۆ ئافرەتی شووکردوو، کە دەتوانێ چەك لە بانکەکان واژوو بکات، دەتوانێ ژمارەیەکی بانکی بۆ خۆی بکاتەوە، گرێبەستی دارایی واژو بکات، بەشە میرات وەربگرێ.[2]

ئەگەر لە سەدەی نۆزدەم ئافرەتی ئەورپی مافی ئەوەی پێدرابێ کە بتوانێ خاوەنی سامانی خۆی بێ، بتوانێ گرێبەست واژو بکات ئەوا ئافرەتی موسڵمان هەرلە سەرەتای هاتنی ئیسلام ئەو مافەی پێدراوە هەروەك خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرمووێ ﴿لِلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبُوا وَلِلنِّسَاءِ نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبْنَ وَاسْأَلُوا اللَّهَ مِن فَضْلِهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا﴾ ﴿النساء: 32﴾

لە 14 ی تەمووزی ساڵی 1789ز، خۆپیشاندانەکی ئافرەتان ڕێکخراو هێرش کرا بۆ سەر کۆشکی ڤێرسای فەرەنسی، داوایان کرد لە شاژن (ماری ئەنتوانیت) پارووێك نانیان بۆ دابین بکات تاوەکو تێر بخۆن، لەگەڵ پێدانی هەندێك سەربەستی، بە گاڵتە

1 ــ الشلبي، مقارنة الأديان، 219/3 .

2 ــ طبارة، عفيف عبد الفتاح، روح الدين الإسلامي، ص 387.

پێکردنێك وەلامی داناوەو گووتی: دەنگی گەدەی ئەو ئافرەتانە کپ بکەنەوە بە کێکێکی ناو بە گوێز.[1]

لە ساڵی 1861 هەندێك لە کچان ویستیان بچنە ناو تاقیکردنەوەی بەکالوریا لە فەرەنسا، بەڵام ڕێگەیان پێ نەدرا تاوەکو خێزانی ناپلیونی سێیەم (ئۆجین) و وەزیر ڕۆلان هاتنە ناو کێشەکەو ڕێگەیان بۆ خۆش کردن تاوەکو بچنە ناو تاقیکردنەوەکان.[2]

## برگەی سێیەم: ئافرەت لە بەریتانیا لە سەدەی نۆزدەهەم

تاوەکو ساڵی 1805ز، بۆ پیاوانی ئینگلیز هەبوو کە خێزانی خۆیان بفرۆشن، دوایی ئەو یاسایە هەڵگیرا. لەساڵی 1931ز، پیاوێك خێزانی خۆی بە 100 پاوەند فرۆشت و بەندکرا بۆ ماوەیەك، چونکە نەیزانی بوو ئەو یاسایە نەماوەو قەدەغە کراوە.[3]

لە یاساکانی بەریتانی ئافرەت ومێردەکەی دەبنە یەك کەسایەتی، بۆ ئافرەت نیە بەتەنها خاوەنی سامان بێت، یان بچێتە ناو گرێبەندی دارایی، تاوەکو ساڵی 1882ز یاسایەکی تر دەرچوو، تیایدا هاتووە تەنها ئافرەت دوای شوو کردن دەتوانێ بەناوی خۆی خاوەن سامان بێت.[4]

پاشای بەریتانیا (هێنری هەشتەم) قەدەغەی کردبوو خوێندنەوەی کتێبی پەیمانی نوێ (ئینجیل) لەلایەن ئافرەتانەوە. تاوەکو ساڵی 1850 ئافرەت بە ئادەمیزاد هەژمار نەدەکرا، تاوەکو ساڵی 1882ز هیچ مافێکی سەربەخۆی نەبوو، بەڵکو وەك سێبەری باوکی یان هاوسەرەکەی بوو.[5]

تاوەکو ناوەڕاستی سەدەی بیستەم بۆ قوتابیە کچەکان نەبوو بەشداری بکەن لە

---

1 ــ كمال مظهر أحمد، المرأة في التاريخ بغداد، دار الحوادث، 1981م، ص33.

2 ــ السحمراني ، مــن قاموس الأديان ، الهندوسية. البوذية. السيخية ، ص62. جــورج. ع. خولم، المرأة عبر العصور، ص21.

3 ــ شوقي أبو خليل، تحرير المرأة ممن؟ وفيم حريتها؟ ص39.

4 ــ طبّارة، روح الدين الإسلامي، ص387.

5 ــ الشلبي، مقارنــة الأديان ، 219/3 .

یانەكان ویەكیەتیەكانی قوتابیان بەتایبەتی لە زانكۆی كامبیرج، هەروەها زانكۆی ئوكسفۆردیش بە چاوی یەكسان تەماشای مافەكانی كچەكان وكورەكانی نەدەكرد لە مافەكانیان، تاوەكو 26 ی تەموزی ساڵی 1964ز بریاری یەكسانی درا لە مافەكانیان وەك قوتابی.[1]

لە سەدەی چواردە لە پۆلۆنیا، لە سەدەی حەقدە لە ئیسپانیا، زۆر لە قوتابیە كچەكان پۆشاكی كورانیان دەپۆشی تاوەكو بتوانن بچنە ناو زانكۆكان بۆ خوێندن، پاش دوو ساڵ لە خوێندن كارەكەیان ئاشكرا بوو، زانكۆ فەرمانی دەركردنی ئەو قوتابیە كچانەی دەركرد پاش سووكایەتی پێكردنەكی زۆرو لێدانێكی چاك. لە هەمان كات لەو دوو وولاتە ئافرەت لە میرات وكاروكاسبی بێبەش كرابوو.[2]

پاش ئەو گەشتە كورتە بەناو كۆمەڵگای ئەوروپی، بینیمان رای پاپاو قەشەكانیان دەربارەی ئافرەت، هەروەها بیرورای پێشەواو زانا هەرە بەرزەكانیان كە سەرۆكی زانكۆكان، دانیان بە بچوكترین مافی ئافرەت دا نەدەدا كە بریتیە لە سەربەستی خوێندن وخاوەنیەتی سامان ومیرات.

هیچ گومانی تیا نیە ئەو جۆرە هەڵسەكەوتە نە شیاو نا مرۆڤایەتیانەی بەرامبەر ئافرەتان كرا لە ئەوروپا بۆ ماوەی چەند سەدە وای كرد لە ئافرەتانی ئەو وولاتانە دژایەتی كەنیسەو هەموو ئەو بریارانە بوەستن كە بەناوی ئاینەوە بۆیان بریار درابوو. تاوەكو گەیشتە ئەو ئاستەی بەرەنگاری هەموو یاساو رێساكانی ئاسمانی ببن، چونكە ئەوەی راست و ناراستە گشتی لێ تێكەڵ ولێڵ ببوو، زۆربەی پیاوانی ئاینی بۆ بەرژەوەندی خۆیان و فەرمانرەواكان بریاری ئایینیان دەردەكرد، هەروەها بە هۆی بێبەش كردنی لە میرات وسامانی خۆیی ومۆڵەتی خوێندن، هەڵسان بە دژایەتی كردنی بریارەكانی میری وخێزان وكەس وكار. بۆ ئەمەش ئافرەت بیری كردەوە لەماڵەوە دەربچێت بە هەر شێوەیەك بێت، چونكە ماڵی لەبەر چاو ببوو بە دۆزەخ وئەوانەی لە ماڵیش لەگەڵی بوون وەك دوژمن هەڵسوكەوتیان لەگەڵدا دەكرد، بۆیە چووە ناو

1ـ الشلبي، مقارنة الأديان، 219/3.

2 ـ كمال مظهر، المرأة في التاريخ، ص31. جورج. خوام، المرأة عبر العصور، ص21.

کارکردن، هەرچەندە دەیزانی کار کردن بۆ ئەو قورسە وسووکایەتی تیایە، بەلام لای پەسەند تر بوو لە ماڵ وسووکایەتیەکانی. هەندێك لە ئارەزوو بازان وشەیتانەکانی ئادەمی ئەو هەلەیان قۆزتەوە بۆ بەرژەوەندی خۆیان، تاوەکو کار گەیشتە ئەوەی شیرازەی خێزان بپچڕێت و منداڵەکان سەرگەردان بن وبەد ڕەوشتی بلاو بێتەوە. هەندێ لە نووسەرە هەلپەرست وسەر لێ شێواوەکانیش لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکان ئەو چوونە دەرەوە بێ بەرنامەیان بۆ ڕازاندنەوە بەناوی (سەربەستی ئافرەت وداواکردنی مافەکانیان، پێشکەوتن وسەربەستی بیروڕاو ئازادی وشۆڕشی جینسی).

## بەندی دووەم : ئافرەت وشۆڕشی پیشەسازی

پاش ئەوەی ئافرەت دڵی پڕ بوو لە ڕق وکینە بەرامبەر بە ئاینی مەسیحی و پیاوەکانی ئاینی، بارگەیەکی زۆری لە ئەزووی دژایەتی هەلگرتبوو بەرامبەر هەموو شتێك ناوی ئاینی پێوە بوو، شۆڕشی پیشەسازی سەری هەلداو هەموو بوارەکانی ژیانی گرتەوە، کارگەو کۆمپانیای زۆر کرانەوە ئافرەتان بە کۆمەڵ چوونە ناو ئەو کارانە چونکە گومانیان وابوو ئەو کارانە خۆشی وسەربەستی وسامانی سەربەخۆیان بۆ دەهێنێتە بەرهەم کە ساڵەهای ساڵە خەونیان پێوە دەبینی. بەلام ئەوەیان لە یاد نەبوو کەوا لە دوای ئەو کارگەو کۆمپانیایانەوە هەندێ ئادەمیزادی درندە هەیە، کە هیچ سۆزو بەزەییەکان لەناو دڵیان نیە، هیچ خووڕەوشت وبنەمایەتی ئەخلاقیان لا نیە تەنها کۆکردنەوەی پارەو سامان نەبێ. ئافرەت بووە کارەکەر لەو شوێنانەو بە ڕۆژانەو مانگانەیەکی زۆر کەمتر لە پیاوان، واتە بووە قوربانی ئەو شۆڕشە پیشەسازیە جا خۆی دەیزانێ یان نا؟

### برگەی یەکەم: شۆڕشی پیشەسازی لە فەرەنسا

لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم ئافرەتان ململانێی پیاوانیان دەکرد لە کارکردن لەو شوێنانە (کارگەکان وکانەکان– المعامل والمناجم)، لە فەرەنسا ژمارەی کرێکارەکانی ئافرەت نیوەی هەموو کرێکارەکان بوو، بەلام ڕۆژانە لە جیاتی 12 کاتژمێر دەبوایە

15 کاتژمێر کار بکەن. لە ساڵی 1831 لە کارگەی چنینی شاری لیۆنی فەرەنسی کە نیوەی ئـافرەت ومنـداڵ بـوون لـە کاتـژمێر سـێی بـەیانی تـاوەکو کاتـژمێر 10ی شـەو کاریان دەکرد، واتە تێکڕایی 17 کاتـژمێر، بـەڵام نیـوەی مووچـەی پیاوانیـان هـەبوو. ژمارەیەکی زۆریان مردن لەبەر ماندوویەتی وبێزاری وناڵەباری دەرونی و شەکەتی.[1]

## بڕگەی دووەم: شۆڕشی پیشەسازی لە بەریتانیا

لە وڵاتی بەریتانیا برسـیەتی و بێبـەش کردنـی ئـافرەت لـە مافـەکانیان پاڵیـان بـە ئافرەتانەوە نا بۆ چوونە ناو کانەکانی خەڵوزی (لانكشاري ويوركشاريه)، کە کارکردن لەو کانانە ناسرابوون بە کاری قورس وبەردەوام، ئەو دیاردەیە وای کرد لە هەنـدێك لـە ڕۆشنبیرو نووسەرەکان باسی باری تەندروسـتی ونـەو مەینـەتی ودەردەسـەریەی کـەوا ئافرەتان تیایدا دەژین بکەن ، هەروەك یەکیان دەڵێ: زۆر جار ئافرەتان لەبـەر مانـدوو بوون ناچاربوون گالیسکەی خەلوز ڕابکێشن لەسەر چۆك وناولەپ، وەك سەگیش زمانی دەر هێناوەو هەناسە تەنگ بووە. زۆر جاریش لەبەر بەرزی پلەی گەرما ناچارە خـۆی ڕووت بکاتەوە تاوەکو نەخنکێ، پیاوانیش بەهەمان شێوە.[2]

ئافرەتەکان لە پیاوان زیاتر کاریان دەکرد بەڵام مووچەیان نیوەی ئەوان بوو، ئەو نا هەقی ونا یەکسانیە وای کرد لە هەندێ ئافرەت شێوەو پۆشـاکی خـۆی وەك پیـاوان لێ بکات تاوەکو هەمان مووچەو مافی پیاوانیان هەبێ .

## بڕگەی سێیەم: لێکدانەوەی باسەکە

لێرەوە دیار دەکەوێت ئەوانەی بانگەشەی دابـین کردنـی مـافی ئافرەتـان دەکـەن و هانیان دەدەن کەوا هەموو کارێك بکەن، بەڵام کاتێ ئافرەتان وەڵامـی بانگەوازەکـەیان دلوە، بینیمان خیانەتیان لە بانگەوازەکەیان کردوو، لەگەڵ پیاوان یەکسانیان نەکردن، بەڵکو وەك نیو پیاو حیسابیان دەکردن هەم لە مووچـەو هـەم لـە مافـەکانی تـری وەك

---

1ـ كمال مظهر، للمرأة في التاريخ، ص29
2ـ كمال مظهر، المرأة في التاريخ، 29-30

مۆڵـەت وکاتـەکانی کـارکردن، خـوای گـەورە دەربـارەی ئـەو درۆزن و دوو ڕووانـە دەفەرمووێ: ﴿ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُوا۟ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴾ الصف: 3.

یەکێك لە لۆردەکان دەڵێ: پێویستە ئافرەتـان ئـەوە پەسـەند بکـەن کـەوا نیـوەی مووچەی پیاوان وەربگرن، چونکە نەفەقەو خەرجی مـاڵ ومنـداڵیان لەسـەر نیـە، بۆیـە ئێمە نیوەی مووچـەی پیاوانمان بـۆ بڕیـار داون.[1]

ئێمەش دەڵێین: ئێـوە کـەی باوەڕتـان بەوەیـە کـەوا خـەرجی مـاڵ ومنـداڵ لەسـەر پیاوە، ئەی ئێوە ناڵێن نابێ پیـاو سـالاری هـەبێ لـە مـاڵ ، ئـەی ئێـوە نـاڵێن هـەردوو ڕەگەز لـە گشت شـتێکدا یەکسانن؟ کوا ئـەو یەکسانیە؟ ئـەی بۆچـی ئافرەتـان 17 کاتژمێر کاردەکەن و پیاوان 12 کاتژمێر؟ دیـارە ئێـوەش ئـەو باوەڕەتـان هەیـە کـەوا توانـای بەرهـەم هێنـانی ئـافرەت کـەمترە لـە پیـاو. یـان هـەر ئارەزووتانـە زیـاتر سـووکایەتیان پـێ بکـەن تـاوەکو زیـاتر بۆتـان مـل کـەچ بـن و وەلامـی ئـارەزووە گڵاوەکانتان بدەنـەوەو خۆیـان بەدەسـتەوە بـدەن، ئینجـا وەك پیـاوان حیـسابیان بـۆ دەکـەن. کەواتـە یەکـسانی لای ئێـوە بـێ بەرامبـەر نیـە، بـەڵکو یەکسانی بەرامبـەر فرۆشتنی کەرامەت وشەرەف وئابڕوو وکەسایەتی ئافرەتە وگۆڕینی پۆشـاك وشـێوەیە. ئێوەی زۆردارو زالم خاوەنی ئەو کۆمپانیـاو کانـەکانی خـەلوز، هـەروەك شـەیتان دێنـە بەرچاومان، چونکە شەیتانیش داوا دەکات لە خـەڵك بـێ بـاوەڕی وکـوفر بکـەن، بـەلام کاتێ وەلامیـان دانـەوەو بوونـە بـێ بـاوەڕ، شـەیتان دەڵێ: مـن لـە ئێـوە بـەریم وکـارم بەسەرتانەوە نیە، من لـە خـوا دەترسـم، ئێـوە خۆتـان زولمتـان لـە خۆتـان کـرد، کـێ گووتی وا بکەن ئـەی تاوانبارینـە؟ خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿ كَمَثَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ إِذْ قَالَ لِلْإِنسَٰنِ ٱكْفُرْ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّنكَ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ الحشر: 16. خوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿ وَقَالَ ٱلشَّيْطَٰنُ لَمَّا قُضِىَ ٱلْأَمْرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ وَمَا كَانَ لِىَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ

---

1 ــ كمال مظهر ، المرأة في التاريخ، ص30

لِيٌّ فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوٓاْ أَنفُسَكُمۖ مَّآ أَنَا۠ بِمُصۡرِخِكُمۡ وَمَآ أَنتُم بِمُصۡرِخِيَّ إِنِّي كَفَرۡتُ بِمَآ أَشۡرَكۡتُمُونِ مِن قَبۡلُۗ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾ إبراهيم: 22

نووسەرێکی فەڕەنسی خاتوو (فرانس کیری)دەڵێ: ئافرەتانی عەرەب مافی یەکسانی کارو یەکسانی هاوسەرێتی و ماڵی وەرگرتووە. ئێمە وەك ئافرەتانی ڕۆژئاوا چاوەڕوانی شارستانیەتێکی ترین کەوا زیاتر بە بەزەیی بێت لەگەڵ ئافرەتاندا، زیاتر داکۆکی و ڕەچاوی مافەکانیان بکات. ئەوەی بەدەستی هێناوە تەنها چەند دەستکەوتێکی کەمەو باری ژیانیشی بەرەو خۆشی نەبردووە. ئافرەت هەر چەوساوە دەمێنێتەوە تاوەکو چاو نەگێڕنەوە بە جۆری ژیان و پەروەردەو ڕۆشنبیری کۆمەڵگە، جا ئەو چ لە کاتێکی نزیك ئەنجام بدرێت یان دوور.[1]

زۆر لە پیاوان لەگەڵ ئەوەدان کەوا ئافرەتان دەتوانن کارەکانی پیاوان ئەنجام بدەن، لەگەڵ ئەوەشدا پێیان ڕەوا نیە هەمان مووچەیان هەبێ، ئەو جۆرە بیروڕایەی کەوا دەڵێن: ئافرەت وپیاو یەکسانن لە توانا، بەڵام نابێ یەکسان بن لە پاداش وماف و مووچە، زۆر باوە لە زۆربەی وولاتانی جیهان، بگرە لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاش بەهەمان شێوەیە. هەر ئەوەشە بۆتە هۆکار ئافرەتان ڕق وکینە پەیدا بکەن بەرامبەر بە هەموو ڕەگەزێکی نێرینە.

ئێمەش ئەو جیاوازیەی کەوا پیاوانی ڕۆژئاوا ئەنجامی دەدەن بەرامبەر بە ئافرەتان بە سوونەتێکی خوایی دەزانین، چونکە هەر کەسێك لە بنەماو سوونەتەکانی خوا وبوونەوەر لابدات جا چ باوەڕ داربێ یان بێ باوەڕ ئەوا خوای گەورە تووشی سەرلێ شێواوی وهیلاکی وشەکەتی وماندوو بوونی دەکات، هەرگیز ژیانیشی ئاسوودە نابێت. ئەو ئافرەتانەش بە هاندانی پیاوانی خاوەن بەرژەوەند و فێڵباز لە ماڵ چوونە دەرەوە بۆ کارێکی زۆر قورس ودوور کەوتنەوە لە منداڵ وخێزان، چوونە بەر دەستی ئادەمیزادی تێر نەخۆر، گورگ لە پێستی مەڕ، لە جیاتی ئاین و ڕەوشت، تەنها پارەو سامان کۆکردنەوە بەرنامەیانە، هەموو هەوڵیان ئەوەیە گیرفانیان پڕ بکەن و وورگیان

---

1ـ البوطي، محمد سعيد رمضان، المرأة بين طغيان النظام الغربي ولطائف التشريع الرباني، ص57.

تێر بکەن و ئارەزووەکان بگەیینە بەرزترین پلەی ڕابواردن لە سەر حیسابی ئابڕووی کچ و ئافرەتانی خزم وکەس وکارو ئافرەتانی کۆمەڵگە ونەتەوەکەیان، لە سەر حیسابی دایکی منداڵ ونەوەکانی دوارۆژیان. ئا ئەوەیە بەرهەمی شۆڕشی پیشەسازی، بەرهەمی یاساکانی سەرمایەداری. هەر ئەو بەرنامەیە دەیەوێت حوکمی هەموو جیهان بکات و دەسەڵاتی خۆی بسەپێنێ بەسەر گشت نەتەوەکان. دەبێ باش بزانن ئەوانە لە کاتێکی نزیك یان دوور بە ملهوڕی و فەسادو بەدڕەوشتی خۆیان لەناو دەچن.

## بەندی سێیەم: دروست بوونی ڕێکخراوەکانی ئافرەتان

لەگەڵ ئەو بارو دۆخە نالەبارو پڕ پەژارەو تاوان وچەوساندنەوە، دەستێکی شاراوە هانی ئافرەتانی دا کەوا لەو کارە قورسانە لە کارگەو کانەکانی خەڵوز بەردەوام بن، بەڵام نەوەستن لە داواکردنی مافەکانیان، خۆیان لەگەڵ پیاوان یەکسان بکەن لە هەموو شتێك، لە پۆشاك، شێوەو ئاکار، ئارەزوو بازی، چوونە دەرەوە، هەموو جۆرە کارکردنێك، ئەمەش نایەتە دی ئەگەر ڕێکخراو یەکیەتی و سەندیکا بۆ خۆیان دروست نەکەن بۆ بەرگری کردن لە مافەکانیان ودژایەتی کردنی خاوەن کارگەو کانەکان وبگرە حکومەتەکانیش، هەروەها داوا کردنی بەشداری لە پەرلەمان و وەزارەتەکان. بە دوای ئەم کارەش تەنها مەبەست ئەوەبوو ئافرەتان بە شێوەیەکی گشتی بکەنە دژی پیاوان وبەیەکجاری لەماڵ دووریان بخەنەوە، گاڵتە بە سۆزو عاتیفەیان بکەن، بە جوانیەکانیان ئارەزووەکانیان تێر بکەن، لە کۆتایشدا ئامانجی زایۆنیەکان بهێننە دی هەروەك لە پرۆتۆکولەکانیان ئاماژەیان بۆ کردووە، ئەمانە هەمووی لە ژێر ناونیشانی مافی ئافرەتان وبەشداری لە هەڵبژاردن وپەرلەمان.

پرۆتۆکولی نۆیەم دەڵێ: گەنجان – بێجگە لە یەهودیەکان– هەموومان تووشی سەرلێ شێواوی وگومڕایی کردوون، تووشی فەسادو بەد ڕەوشتیمان کردوون بە هۆی ئەو بیردۆزانەی کە بۆمان دارشتوون، هەرچەندە دەزانین کە ئەو بیردۆزانە فاسدە، لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە ئەوانمان وا چەواشە کردووە کە لەسەریان بڕۆن.[1]

---

1ـ عجاج نويهض، بروتوكولات حكماء صهيون، 2/217 ـ 220.

----

یەکەم دیاردەی بەرز کردنەوەی ئاڵای یەکسانی نێوان پیاوو ژن لە فەرەنسا بوو، پاش بەشداریان لە شۆڕشی فەرەنسی وسەرکەوتنی ئەو شۆڕشە. داوای مافی خوێندنیان کردوو، لەگەڵ دروست کردنی ڕێکخراوی ئافرەتان ویانەی جیاجیا، حکومەتیش لە سەرەتا بە ناچاری وەڵامی داواکاریەکانی داوە. پاش ماوەیەکی کەمیش فەرمانێکی کۆماری دەرچوو لە ساڵی 1793 ز بە داخستنی گشت ئەو بنکانەی سەر بە ئافرەتانەوە بوو. لە پاش ئەو ڕووداوە بزووتنەوەی ڕەگەزی ئافرەتان ( Feminism - حركة العنصر النسوي( سەری هەڵدا، پاشان ناوی گۆڕدرا بە بزوتنەوەی ئافرەتان لە پێناوی یەکسانی(حركة المرأة لأجل المساواة). لە بنەماو ئامانجەکانی ئەو بزوتنەوەیە:[1]

1- یەکسانی تەواو لەگەڵ پیاوان

2- مافی خوێندن

3- کردنەوەی بواری کارکردن

4 - مافی هەڵبژاردن وبەشداری لە کاروباری ڕامیاری

ئەو خاڵانە مافی ڕەوای خۆیانە، بەلام تاوەکو ئێستا تەنها بە گوتەو نووسینە نەوەك کردار.

پاش ئەوەی ئەمەریکا سەربەخۆیی وەرگرت لە ساڵی 1783ز، دەنگی ئافرەتان بەرز بۆوە بۆ بەشداری لە هەڵبژاردنەکان، پاش بەشداریان لە کاری ڕزگاری وولات و سەربەخۆیی.

لە ساڵی 1848ز، لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا یەکەم کۆنگرەی ئافرەتان بەسترا لە مێژوودا، بۆ بەرگری لە مافەکانی ئافرەتی ڕۆژئاوا، بڕیاریشیاندا کەوا ساڵانە ئەو کۆنگرەیە ببەستن.[2]

---

1ـ كمال مظهر، المرأة في التاريخ، ص34. شيرين أميدي، المرأة وأمجاد لتحاد نساء كردستان، ص14.

2ـ كمال مظهر، المرأة في التاريخ، ص37. معن خليل، علم اجتماع الأسرة ، ص173.

لە ساڵی1867ز، لە ئەمەریکا کۆمەڵەی گشتی ئافرەتانی ئەمەریکا دامەزرا و لەهەمان ساڵ کۆمەڵەی ئافرەتانی جیهانی دامەزرا.

لە ساڵی 1867ز، ئافرەتانی بەریتانیا داوای بەشداریان کرد لە هەڵبژاردنەکان، دوای ئەم داواکاریە (یەکیەتی نیشتمانی ئافرەتانی ئینگیزی) دامەزرا. پاشان ئافرەتانی ئەڵمانیاو سویسراو نەرویج ودانیمارک وکەنەداو فەرەنساو ئیتالیا شوێنی ئەوان کەوتن وهەمان یەکیەتی وکۆمەڵەیان دامەزراند.[1]

لە ساڵی 1914ز، یەکەم یەکیەتی ئافرەتانی جیهانی لە پێناوی یەکسانی لە هەڵبژاردنەکان دامەزرا. لە ساڵی 1917ز، ئافرەتانی شەش وڵات بەشداریان لە هەڵبژاردنی گشتی کرد، لە ساڵ 1944 کێشەی ئافرەتان لێکۆڵینەوەی لەسەر کرا، لە ساڵی 1966 ز بڕیاری دامەزراندنی یەکەم یەکیەتی ئافرەتانی جیهانی درا.

لە ساڵی 1970ز، ئافرەتانی 72 وڵات کۆبوونەو بڕیاریاندا کە یەکەم کۆنگرەی ئافرەتان ببەستن، ئەوە بوو لە ساڵی 1975ز، یەکەم کۆنگرە بەسترا لە مەکسیك. لە ساڵی 1980ز، لە کۆبنهاگن– دانمارك کۆنگرەیان بەست لە ژێر ناونیشانی یەکسانی گەشە کردن، لە ساڵی 1985ز لە نایرۆبی، چوارەم کۆنگرە لە پەکین بەسترا لە 16 ی ئەیلولی ساڵی 1995 کە تیایدا 5000 ئافرەت بەشدار بوون یەکیان کورد بوو.[2]

ئێمەش دەڵێین ئەو یەکیەتی وڕێکخراوەی ئافرەتان ئەگەر سەربەخۆ بن، پابەندی ئەم لاو ئەولا نەبن، خەریکی ڕێکخستنی کاری تایبەتی ئافرەتان بن، گرنگی بە خوێندن و وەرگرتنی زانست وزانیاری بدەن، هانی کچەکان بدەن کە سەرکەوتن بەدەست بهێنن لە زانکۆکان، گرنگی بەکارە دەستیەکانی ئافرەتان بۆ سوودی بازرگانی وپیشەسازی نەتەوەیی بدەن ئەوا سەرکەوتوون وبەرەو پێشەوە دەچن، (بە درێژی باسی کاری ڕێکخراوەکانی ئافرەتان وقوتابیانی کچمان کردووە لە کتێبی پیاوان وژنان تەوکاری نا یەکسان– دانەر)، بەڵام زۆرجار تەنها گرنگی بەو شتانە دەدەن کەوا بێجگە لە زیان

1ــ کمال مظهر، ص37. معن خليل، علم اجتماع الأسرة ، ص173.

2ــ شیرین لمیدي، المرأة ولمجاد اتحاد نساء کرد ستان، ص 17 وما بعدها

هیچ سوودیکی بۆ کۆمەڵگە نیە، هەروەها زۆرجار جیاوازی دەکرێت لە نێوان ئافرەتان خودی خۆیان ئەوەش لەسەر بنەمای نەتەوەیی وحیزبی و تەمەنی ئافرەت. لەوانەیە لەبەر ئەو هۆیانەو هەندێ هۆی تره بووه کەوا فەیلەسوفی ئەڵمانی نیتشه[1] ئەو وتەیە دەڵێ: بزوتنەوەی ئافرەتانی بەو شێوەی کە هەیە، سووکایەتیەکە پیاوان بە ئافرەتانی دەکەن، هەموو ئافرەتێکی هەست ناسك وچاك پەروەردە کراو، شەرم لە خۆی دەکات بەشداری بکات. بەڵکو پێویستە گرنگی تایبەت بە ئافرەتان بدرێت و چاودێری وپارێزگاریان بکرێت...[2]

## بەندی چوارەم: ئافرەتانی رۆژئاوا چ سوودیکیان بەدەست هیناوە لەو بانگەوازە؟

لێرەدا تەنها باسی ئافرەتانی رۆژئاوا دەکەین بزانین چ سوودیکیان بەدەست هیناوە، چونکە ئەوان خۆیان بە پێشەنگی ئەو بزووتنەوە دادەنێن ودەیانەوێت خەڵکان وکۆمەڵگەکانی تر شوێن ئەوان بکەون تاوەکو لەو پێشکەوتن ولەو سوودانە بێبەش نەبن. ئافرەتی رۆژئاوا چی بەدەست هێناوە لەو فەلسەفەیە؟

1- مێینە لە رۆژئاوا کاتێ لە تەمەنی گەنجیە، ئەو دەست وئەو باوەش دەکات، لای ئەو گورگ بۆ ئەو گورگ هەنگاو دەنێ، هەموو رێزگرتن وقسەی خۆش ومل دانواندن تەنها لەبەر خاتری جوانیەکەی وگەنجیەکەیەتی، هەر کاتێ نێرینەکان کارەکانیان تەواو بوو، جوانی ئافرەتەکە بەسەر چوو، ئارەزووەکانی نەما، ئەوا نە رێز دەمێنێ نە مل دانواندن، لای ئەوان رێزگرتن بێ بەرامبەر نیە، ئافرەت کاتی پیری هیچی نەماوە پێشکەش بکات بۆیە رێزیشی لێ ناگیرێ. لە فەرهەنگی ئەوروپی سەرمایەداری شتی بێ بەرامبەر نیە، چونکە هەموو شتێك لایان ماددەیە.

---

1 ـ نیتشة: (1844-1900)، فەیلەسوفێکی ئەڵمانیە، مەزهەبی پەرەسەندنی گرتەبەر، لە دامەزرێنەری رەگەزی ئەڵمانیە، لە کتێبەکانی(سەرهەڵدانی کارەسات و گیانی موسیقا، زەرادەشت بەم شێوەیە گفتوگۆی دەکرد). المنجد في الأعلام، ص582.

2 ـ شوقی أبو خليل، الاسلام في قفص الاتهام، ص4.

2- کاتێ کە دەبێتە هاوسەری پیاو پێویستە لەسەری بەشداری بکات لە دانەوەی بەشەکانی قەرز لە مووچەی خۆی پاش ئەو هەموو ماندوو بوون وشەکەتی جەستەیی ودەرونی. لە زۆر لە وولاتانی رۆژئاواش ئافرەتان پێویستە لەسەریان ناومالّ دابین بکەن پێش گواستنەوە، ووشەی دۆتەش (دوطة)[1]، هەر لەوەوە هاتووە. ئەو هەموو بارگرانیە لەسەر ئافرەت وای لێدەکات ژیانی لا تالّ بێت وبەرگەی نەگرێ، ووردوو خاشی بکات، ئەوەی زۆر گرنگیشە زۆربەی جاران کارەکان بۆ جەستەو دەرونیان گونجاو نیە بەلاّم باری ژیان وای لێدەکات هەر بەردەوام بێ، بەم شێوەیە جوانی و گەنجیەتی وکەسایەتی ودایکایەتی هەمووی قوربانی ئەو ژیانە تالە دەکات.

3- پاش ئەوەی ئافرەت گەیشتە تەمەنی پیری، هەموو ئەو هۆکارانەی ئەما کەوا ئارەزووی گەنجەکانی تێر دەکرد، ئەوا لە جیاتی رێزو خزمەت پشتی تێدەکرێت وسووکایەتی پێدەکرێت وپشت گوێ دەخرێت، یان لەمالّەوە بەتەنها دەمێنێ تاوەکو مردنی، یان دەکەوێتە خانووی پەککەوتەکان پاش دەرکردنی لەلایەن منداڵەکانی، هەرگیز چاوەروانی ئەوە نیە منداڵەکانی سەردانی بکەن وسۆزو بەزەییان بۆ بجولێ، بەلکو تەنها چاوەروانی ئەوەیە فریشتەی روح کێش کەی دێتە میوانی ودەچێتە داهاتووەکی نادیاری سەخت.

4- جێهێشتنی منداڵە ساواکانی لە ژێر سۆزو بەزەیی لێپرسراوانی داینگەکان وباخچەی ساوایان. هەموو زانایان لەگەلّ ئەوەن کەوا ئەو منداڵەی لەو شوێنانە پەروەردە دەکرێن – دوور لە سۆزو بەزەیی و باوەشی گەرم وشیری دایکی– ئەوا زۆربەیان گەشە دەکەن لەسەر دەرونێکی ئالۆزو دژوارو درندایەتی، دوور لە بەزەیی وخۆشەویستی، واتاکانی کۆمەلاّیەتی وخزمایەتی نازانێ، بەهاو بنەما بنەرەتی وبەنرخەکانی کۆمەلاّیەتیش فێر نابێت، نازانێ بۆچی دەژیت وبۆ کوێ هەنگاو دەنێ لە ژیاندا. بەم هۆیەوە کێشەی کۆمەلاّیەتی وئابووری وخێزانی زۆر دەبێت لەناو کۆمەلگە.

---

1ـ طبارة، روح الدين الإسلامي، ص365.

5- جوان تێ نەگەیشتنی ئەو ئافرەتانە لە واتای ئازادی وسەربەستی کارو کردەوە، وای کردووە لەئافرەتان وەك کالایەك بەکاریان بهێنرێن لەلایەن پیاوان بۆ مەرام وئامانجەکانی خۆیان، بە هاندانیان بۆ چوونە دەرەوە بۆ کارکردن لە کارگەو کانەکانی خەلوز بە کرێیەکی کەمتر لە پیاوان، یان بەکار هێنانی جوانیەکەیان بۆ ئەوەی بیانخەنە سەر ڕووی دەرەوەی کالاکانیان تاوەکو زووتر و زۆرتر بفرۆشێ وەك پاککەرەوەکان(سابوون و وردەی جل شۆرو بۆن و شامپۆ...هتد. وکەلوپەلی تری مال) کە زۆربەی دوایی دەکەوێتە ناو زبلدان وجۆگەو زۆنگاوەکان، یان بۆ ڕازاندنەوەی فلیمەکانی سینەما..هتد. ئایا خوشکانی بەرێز ئێوە ئەوە بە ماف وئازادی وسەربەستی دادەنێن؟ یان سووکایەتی وگالتە پێکردنە؟

6- فەلسەفەی ڕۆژئاوا هەموو بنەماکانی خێزان وهاوسەرێتی وگەورەو بچوکایەتی و گونجاویەتی وشیاوی لە باربردوو نەیهێشت، تاوەکو کار گەیشتە ئەوەی هەموو خێزان لێك هەلوەشێتەوەو ئەندامانی سەرگەرەدان بن، مندالەکانی کەم ئەزموون بن، تووشی دەیەها کاری نالەبارو نابەجێ ببن. هەروەك ئاشکرایە کەوا کۆمەلگە بریتیە لە ژمارەیەك خێزان، ئەگەر ئەو خێزانانە یاساو ڕێسای تیا نەما بۆ هاوکاری و ڕێزگرتن ئەوا کۆمەلگە هەمووی تووشی لەرزینی کیان وجود دەبێت.

7- بلاو بوونەوەی زۆر لە نەخۆشیەکانی زایندەیی وئەیدزو هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی وسوزەنەك وفەرەنگی، جگە لە نەخۆشیەکانی دەرونی وعەصەبی، خووگرتن بە دەرمانە بێهۆش کەرەکان، بەرز بوونەوەی ڕێژەی خۆکوشتن، نەمانی سۆزو بەزەیی وگیانی پێکەوە ژیان وهاوکاری ناو خێزان وکۆمەلگە.

8- ئایا ئافرەتانی ڕۆژئاوا گەیشتنە ئەو سەربەستیەی خەونیان پێوە دەبینی؟

بۆ وەلامی ئەو پرسیارە گوێ دەگرین لەو ئافرەتەی گەیشتۆتە پلەی قازی لە یەکێك لەو وولاتانەی کە پێشکەوتووەو بەپلەیەکی زۆر بەرزو نایاب سەربەستی ئافرەتی داوەو بە هیچ شێوەیەك جیاوازی نەهێشتووە لە نێوان پیاو ئافرەت لە هەموو بوارەکانەوە، ئەو ئافرەتەش (بریجیدا ئۆلف هامر) کە لەلایەن نەتەوە

یەکگرتووەکانەوە دەست نیشانکرا بۆ لێکۆلینەوە لە کێشەی ئافرەتان لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست. ئەو ئافرەتە چوار شوێنی هەلبژارد، ئەوانیش:

1- ناوچەی ئەبی طشت لە صەعیدی میسر
2- ناوچەی سەیدی تەمراز لە تونس
3- ناوچەی میصراتە لە لیبیا
4- شاری سولەیمانیە لە کوردستانی عێراق

پاش مانەوەو گەڕان وپرسیار کردن ولێکۆلینەوە گەیشتە ئەو ئەنجامانە:

1- ئافرەت لەو وولاتانەی گەڕاوم تیایدا سەربەستی زیاترە لە ئافرەتانی سوید.
2- ئافرەتانی ناوچە دوورەکانی میسر هەرچەندە لە کۆمەلگەو شارستانیەتی دوورن، بەلام بارێکی وایان بۆ ڕەخساندوون کەوا نزیکە لە پیرۆز ڕاگرتنی ئافرەت، نەوەك بەندایەتی.
3- زۆر بە ئاشکرا دیارە کەوا فەرمان ودەسەلاتیان بەسەر پیاواندا زالە هەر لەبەرە بەیان تاوەکو تاریکی شەو.

تەواوی بڕگەکە بە زمانی عەرەبی: تمارس وضعاً ينتمي إلى القداسة لا إلى العبودية، وتتسلط على الرجل تسلطاً فعلياً، ابتداءاً من شؤون النهار، وإنتهاءً بشجون الليل.[1]

هەروەها دەلێت: ئافرەتی سویدی تاوەکو یەکسانی بەدەست هێنا لەگەل پیاو تووشی حەوت دەردەسەری ودۆخە بوو، بەلام پاش ئەوەی لە ڕەگەزی مێینەی خۆڕسکی خۆی بێبەش بوو، تاوەکو بوو بە بوونەوەرێکی شێوە پیاو، ئەو ئازادی ویەکسانیە وەك ئەوەیە، یەکێك مالی لە بەهەشت بێت وئازاد بکرێت بەوەی کە دابەزێنرێ بۆ سەر زەوی، یان سەربەخۆیی بدرێتە تاووس وببێ بە قەلەڕەشکە. بەکورتی ئەو ئازادیەی ئێمە داومانە بە ئافرەت لەوەدایە کە دەبێ ببێ بە پیاو.

---

1ـ شوقي أبوخليل، تحرير المرأة ممن؟ ص32.

هەروەها دەڵێت: بەڵام سەربەستی وئازادی ئافرەتی ڕۆژهەڵات هەروەك سەربەستی پیاوە، بەبێ ئەوەی بوونی خۆی وون بكات، هەریەكیان لە بواری كاری خۆی ئازادە، هەریەكیان بەڕێگەی تایبەتی خۆی كاردەكات. بەڵام ئافرەتی ڕۆژئاوا لە كاتی ئەنجامدانی یەكسانی شان لەشانی پیاو دەدات وبەربەرەكانی و ململانێی توندی لەگەڵدا دەكات، لە هەمووی سەیرە ئەوەیە: ئەو سەربەستیە زۆرەی بە ئافرەتان دراوە وای كردووە پیاوان ببنە نیچیرو ئەوان ببنە ڕاوكەر.

لە ڕاپۆرتێكی وەزارەتی كاروباری كۆمەڵایەتی سویدیدا هاتووە: نزیكەی 25٪ ی دانیشتوان تووشی یەكێك لە جۆرەكانی نەخۆشی دەماری ودەروونی بووە. هەروەها 30٪ ی خەرجی پزیشكی لەو نەخۆشیانەدا خەرج دەكرێت. هەروەها لە ساڵانی نێوان 1951-1968ز، ڕێژەی خۆكوشتن لە نێوان ئافرەتاندا زۆر زیادی كردووە، لە هەر هەزار ئافرەتدا 6.2 ئافرەت خۆی دەكوژێت، ئەو ڕێژەیە زیادی كردووە بۆ 12.1٪. سویدیش، كەوا لەو وڵاتەیە لەو وڵاتانەیە، كە باری ئابوری نایابە، داهاتی تاكەس تیایدا زۆر بەرزە، لەگەڵ ئەوەشدا ئافرەتان تیایدا ئاسوودە نین، چونكە هەرگیز ماددە بەتەنها هۆكاری خۆشی نیە ئەگەر لایەنی روحی لەگەڵدا هاوشان نەبێت.[1]

(بیتریم سارۆكین) بەڕێوەبەری لێكۆڵینەوەكان لە زانكۆی هارفەردی ئەمریكی لە كتێبەكەی بە ناوی (شۆڕشی جینسی)دەڵێ: ئەمەریكا بەرەو كارەساتێكی جینسی بەربڵاوی فەوزەوی هەنگاو دەنێت، كەواتە ئەمەریكا بە هەمان ئەو ئاراستەیەدا دەڕوات كە بووە هۆی ڕووخان ونەمانی هەردوو ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی و ئەغریقی لە سەردەمانی زوودا. ئێمە ئێستا دەورە دراوین بە شەپۆلێكی جینسی كە هەموو ژوورەكانی فەرهەنگ وڕۆشنبیری ئێمەی داگیركردووە، هەموو بوارەكانی ژیانیشی گرتۆتەوە، هەر ئەو شۆڕشە بووە هۆی گۆڕانی هەموو ژیانی پیاوو ئافرەتێكی ئەمەریكی، كاریگەری زۆر زیاتر بوو لە هەموو جۆرەكانی تری شۆڕش.[2]

---

1ـ شوقي أبوخليل، تحرير المرأة ممن؟ ص40.

2 ـ شوقي أبو خليل، الاسلام في قفص الاتهام، ص246.

(مارلین مورۆی) ئەستێرەی سینەما، پێش خۆکوشتنی ئەو نامەی نووسی بۆ یەکێك لە هاوڕێکانی کە دەیویست کار بکات لە سینەما: ئاگاداری ناوبانگ بە، ئاگاداری ئەوانە بە کە بە ڕووکار هەڵتدەخەڵەتێنن، من نا ئاسوودەترین ئافرەتم لەسەر زەوی، چونکە نەم توانی لە ژیاندا ببم بە دایك، من ئافرەتێکم ژیانی ماڵ وخێزانم لا پەسەندترو بەنرخترە لە هەموو خەزێنەی دونیا، ئاسوودەیی وخۆشی ئافرەت لە ژیانی خێزانداری پاکدایە، بگرە ژیانی خێزانداری پاك نەك تەنها نیشانە وسمبۆلی خۆشی وکامەرانی ئافرەتە، بەڵکو هی هەموو مرۆڤایەتیە. هەروەها دەڵێت: هەموو خەڵك زوڵم وتاوانیان بەرامبەرم کرد، لە دوایدا تێگەیشتم کەوا کارکردن لە سینەما کارێکی سووك وبێ نرخ و هەرزان بەهایە هەرچەندە بەڕووکار ناوبانگێکی تیایە.[1]

بەم شێوەیە ئەم ئافرەتانە زوڵمیان لە خۆیان کردو لە خەڵکانی تریش، بەتایبەتی لە جگەر گۆشەکانیان، خۆشی وسەربەرزی وئاسوودەی دونیاو دواڕۆژیشیان دۆڕاند.

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ٱسۡتِكۡبَارٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَكۡرَ ٱلسَّيِّيِٕۚ وَلَا يَحِيقُ ٱلۡمَكۡرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهۡلِهِۦۚ فَهَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ ٱلۡأَوَّلِينَۚ فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلٗاۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحۡوِيلًا﴾ فاطر 43.

لەگەڵ ئەو هەموو مەینەتیەی بەسەر ئافرەتدا هات، ناوەندەکانی ڕاگەیاندن بەهەموو شێوەو جۆرەکانیەوە ئەو کارەی ئافرەتیان بە سەربەستی لەقەڵەم دەدا، سەربەستی دوورکەوتنەوە لە خێزان، سەربەستی ئابووری، سەربەستی هەڵسوکەوت، سەربەستی تێرکردنی ئارەزووەکان، سەربەستی لە گوێڕایەڵی دایك وباوك...هتد، هەرچەندە زۆربەیان دەیانزانی ئەو جۆرە کارە گونجاو نیە بۆ ئەو پێکهاتە ناسك و بەسۆزە، کە ئافرەتە.

بەڵام وادیارە ئافرەتان لە ڕۆژئاوا بەهۆش خۆیان نایەنەوە تاوەکو نەخۆشیە ڤایرۆسیەکان ودەروونیەکان وکۆمەڵایەتیەکان لەناویان دەبات لە کاتێکی نزیك یان دوور هەروەك چۆن گەورەترین ئیمپراتۆریەتی جیهان (ئیمپراتۆریەتی ئەغریقی) بەهۆی

1ـ السباعی، مصطفی، المرأة بین الفقه والقانون، ص3.

بەدڕەوشتی وفەسادی کۆمەڵایەتی لەناو چوو، نەیتوانی بەرگەی هێرشەکانی کوڕی دارای گەورەی شای ئێران بگرێت وزۆر بەئاسانی لەناوی برد. لەو باوەڕەشدام کەوا ئەو مێژووە هەردووبارە دەبێتەوە. کاتی مێژووی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی دەخوێنیتەوە دەربارەی سەربەستی ئافرەت لە هەندێك لە کاتەکاندا، سەرسوڕمان دەتگرێت ودەپرسی ئەو هەموو بەناو سەربەستیە لە پێناوی چی؟ دەسەلاتیان زۆر بوو، زیاتر لە دەسەلاتی پیاوان، دەبوایە پیاوەکان کڕنوشیان بۆ ببەن تاوەکو ڕێگەیان بدەن بۆ تێرکردنی ئارەزووەکانیان. پاش ئەوەی شکستی سەربازیان بەسەردا هات، بە ئاگا هاتنەوە کەوا هەموو ئەو نەهامەتی وسەرشۆڕیەی بەسەریاندا هاتبوو لە ئەنجامی ئەو سەربەستیە بێ سنوورەی درابووە ئافرەتان، کە ببووە هۆی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵگە لە هەموو بوارەکانەوە. دوای ئەو مێژووە دەست کرا بە زوڵم کردن لە ئافرەت بە هەموو شێوەیەك ولە هەموو بوارەکانەوە کە جگەر بۆی لەتلەت دەبێت کاتی خوێندنەوەو بیستنی ئەم زوڵم وستەمانە، لێرەدا چەند گۆشەیەکمان لەو دیمەنانە خستە ڕوو. ئێمە دەپرسین، ئەو سەربەستیەی یەکەم جار لە پێناوی چی و ئەو زولم ودڕندەیەی دوایی لەبەرچی؟

خاوەنی فەرهەنگی (دائرة معارف القــرن العــشرين) باسی ئەو دیمەنانەمان بۆ دەکات کەوا کۆمەڵگەی ڕۆمانی تێیدا دەژیا لە هەردوو بارەکەدا: کاتێ وولاتی ڕۆمان دەسەلاتیان بەسەر زۆربەی وولاتانی ناوچەکە گرت، ئارەزوویان بۆ ڕابواردن و ژیانی و خۆشی سەربەستی لە سنوور دەر چوو، ئەو ئارەزووە تێرکردنەش نایەتە دی تەنها بە تێکەلاوی هەردوو ڕەگەز نەبێت (بیرۆکەی مولحدەکانی کۆنی یۆنانیش هەر لە خەیال و ئەندێشەیاندا هەڵواسرابوو کە بانگەشەی بۆ ئارەزووبازی دەکرد) ئەوەبوو ئافرەتان سەرەتا سەرپۆشیان لاداو، هاتنە ناو کۆمەڵگەیەکی لە خۆبایی بوو بە سەرکەوتنەکانی، دوایی دەستیان خستە ناو کاروباری ڕامیاری وپۆستە بەرزەکانی وولات، هەموو جۆرە بەد ڕەوشتیەك ئازاد کراو ڕێگەی پێدرا، هەموو ئەوانەی بە خەیالی ئادەمیزادا دێت دەستیان نەپاراست تیایدا. دوایی سەردەمێکی تر هاتە پێشەوە بەرەبەرە ئافرەت گۆشە گیر کرا، تاوەکو گەیشتە پلەی توندترین ئازارو لێدان و

ســـوکایەتی پێکـردن. ئـەو بارودۆخـە بـەردەوام بـوو تـاوەکو سـەدەی هـەژدەم و ناوەندەکانی سەدەی نۆزدەم، هەروەك باسمان کردن.

له کۆتایدا دەڵـێ: ئـافرەتی داماو وەك یاریەکـە بەدەست پیاوانـەوە، کـاتێ خـۆی دەپارێزێ وباوەڕداره، لەماڵ بەندی دەکـات ومافـەکانی پێشێل دەکـات، کـاتی فێـری ئارەزووبازی دەکات ولەگەڵی ڕادەبوێرێ، دەبینین گاڵتە بـە سـۆزو عاتیفـەو دڵ نـەرمی وناسکیەکەی دەکات، هەر خۆشی فێری خـۆ ڕازاندنـەوە بـەفیرۆدانی سـامانی دەکـات، بەڵام پیـاو کـاتێ بینـی ئافرەتەکـە بۆتـە بـارێکی گـران لەسـەری لـە ڕووی ئابوریـەوە دووباره بە توندترین شێوە سزای دەدات.[1]

ئـەو جـۆرە ژیانـە لـە زۆربـەی کۆمەڵگـەکانی دوور لـە بەرنامـەی خـوا ڕوو دەدات، هەرچەندە ئەگەر ئەو کۆمەڵگەیە بە ناوو ڕووکار خۆشیان بە موسڵمان هەژمار بکەن.

ئـەو ئەنجامـە ناپەسـەندو نالەبارانـەی باسمـان کـردن هـەمووی لـە ئـەنجامی ئـەو بانگەشە بێ بەرنامەیە کەوا هەندێك کەس هەوڵی بۆ دەدەن، بێ ئەوەی بیر بکەنەوە لە دوا ڕۆژێکی دوور وبپرسن ئایا ئەو کاروانە کۆمەڵگە بـەرەو کـوێ دەبـات؟ یـان ئەوانـە تەنها هەموو ئامانجیان تێرکردنی ئارەزوو ودەرونە نەخۆشـەکانیان وپڕکردنـی گیرفانـە دڕاوەکانیان و ووڕگە زلەکانیانە.

لە پرۆتۆکۆلی سێیەمدا دەربارەی ئازادی دەڵێ: ووشەی ئازادی، کۆمەل ونەتەوەکان بـەرەو ململانـێ وبەربـەرەکانی وشـەڕ دەبـات، تـا وای لێـدێت شـەڕ لەگـەڵ خـواو سوننەتەکانی خوا لە بوونەوەردا بکەن. بـەڵام کـاتێ ئێمـە دەسـەڵات ومـولکی خۆمـان بەسەر هەموو زەویدا سەپاند، ئەوا ئەو ووشەیە لە فەرهەنگی ژیان دەسڕینەوە، چونکە ئەو ووشەیە بنەمای ئەو هێزە گێرەشێوێنەیە کە زۆر تینوی خوێنە هەروەك وەك چۆن ئاژەڵە دڕندەکان تینوی خوێنن.[2]

---

1 ــ محمد فريد وجدي، دائرة المعارف القرن العشرين، 622/8 . الحديث عن المرأة

2 ــ عجاج نويهض، بروتوكولات حكماء صهيون، 192/2 .

تەماشای ئەو جیاوازیە بکەن لە نێوان ئەو بەرنامەی کە خوای گەورە داینـاوە بـۆ ئـازادی وسەربەسـتی ئـادەمیزاد و ئـەو بەرنامـەی کـە هـاتووە لـە بیرۆچـکەکانی تـری دەستکردی مرۆڤ.

جا کەواتە ئەی ئافرەتی ژیـر ئـەی خوشـکی بـەنرخ وبـەڕێز: تەمـەنی مـرۆڤ کورتـە، بەرنامەی ژیانت دابڕێژە بۆ بەرژەوەندی دونیاو دواڕۆژی خۆت وبراو باوکت، بەرنامـەی ڕاست وچەوت جیا بکەوە، کاری خۆت بکە لە شـوێنی کـارکردن، بـەڵام کـاری گونجـاو هەڵبژێرە، بەدوای ئارەزوو وخۆشی کاتی مەکەوە کە تەنها ناوزەدەکردنی بـۆت تیایـە، خۆت لە خۆشی وبەختەوەری دایکایەتی و پـەروەردەی منـداڵ بێبـەش مەکـە، چـونکە هەموو خۆشی وماڵی دونیا ناکەتە یەك ووشـەی (دایـك) کـاتێ منداڵـە چـاو گەشـەکەت پێت دەڵێ: دایە گیان. بۆ زیاتر چوونە ناو باسی دایکایەتی وئارەزووی ئافرەت بۆ ئەو سۆزە بگەڕێوە کتێبی دانەر ( پیاوان وژنان تەوکاری نا یەکسان بەرگی یەکەم– بەشـی سێیەم).

# بەشی چوارەم

## سەرهەڵدانی کێشەی سەربەستی ئافرەت لە جیهانی ئیسلامیدا

## باسی یەکەم: مێژووی بانگەوازی کێشەی ئافرەت لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا

دوای دەرکەوتنی بێ هێزی موسڵمانەکان، بێ باوەڕان هەوڵیاندا خۆیان بگەیینە ناو کۆمەڵگەی ئیسلامی، بۆ چاندنی تۆی دووبەرەکی نەتەوەیی وسەپاندنی کەلتوور فەرهەنگ وڕۆشنبیری وبیرۆکەی نامۆی خۆیان لەناو ئەو کۆمەڵگەیانە. پاش ئەوەی لێکۆلینەوەیەکی زۆریان کرد بەهۆی ڕۆژهەڵاتناسەکانەوە لەسەر ئەو خاڵە لاوازانەی ناو کۆمەڵگەکانی ئیسلامی لە بواری خوێندن و پێشێلی مافی ئافرەت ودواکەوتنی ئابوری وپیشەسازی، دەستیان کرد بە بانگەشە کردن بۆ بەناو چاکسازی وپێشکەوتن ودژایەتی کۆنەپەرستی و مافی ئافرەت.

لەو دوو سەدەی دوایی کۆمەڵگەی ئیسلامی بەتەواوی پشتی لە ئاینی ئیسلام وبەرنامەکانی کردبوو، هەموو گرنگی بریتی بوو لە بیری نەتەوایەتی وچۆنیەتی هەنگاونانی بەرەو پێشکەوتن بۆ گەیشتن بە وڵاتانی ئەوروپی. لە ئەنجامی ئەو دوورکەوتنەوەی موسڵمانان هەندێ داب ونەریتی کۆمەڵایەتی ناپەسەند خۆی خزاندە ناو کۆمەڵگەکانی ئیسلامی لە ئەنجامی کەمتەرخەمی زانایان وجێبەجێ نەکردنی فەرمانەکانی خوا لەلایەن تاك وکۆمەڵەوە، هەروەها بە هۆی بڵاوبوونەوەی نەخوێندەواری، هەموو ئەو خاڵانە بوونە بەڵگەو پاساو بۆ ئەوانەی چەندەها ساڵ بوو بەنیازی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵگەکەمان بوون وخەونیان پێوە دەبینی، ئەوا زۆر بە ئاسانی کەوتە بەردەستیان. لە پشت خاوەنی ئەو بانگەوازانەوە، وڵاتانی ئیمپریالیزمی وناوەندەکانی ڕاگەیاندن هەبوو، کە بەهەموو تواناکانیانەوە هاوکاریان دەکردن، نازناوی جوان ودرەوشاوەیان بۆ کارەکانیان هەڵدەبژارد، وەك: مافی نەتەوەیی، مافی کرێکاران، مافی ئافرەتان، پێشکەوتن وخۆش گوزەرانی، تەکنولوژیاو پیشەسازی، نەهێشتنی نەخوێندەواری، سەرکردەکانی وڵاتە ئیسلامیەکانیش کەوتنە شوێنیان، بەڵام دوای ئەوەی دوژمنان ئامانجەکانی خۆیان پێکا هیچ یەکێکیان لەو گوتە شیرین وڕازاوەو نازناوە جوانانەیان بۆیان جێبەجێ نەکرد، بەتایبەتی پێشکەوتن

وپیشەسازی ومافی نەتەوەیی وخۆش گوزەرانی. لە جیاتی ئەوە وولاتەکانی ئیسلامی لە ژێر فەرمانڕەوایی ئەو جۆرە سەرکردانە گەیشتنە پلەیەکی بەرز لە دژایەتی کردنی یەکتری بەناوی نەتەوایەتی، نەمانی ڕێزو ئاداب ورەوشت، دواکەتنی پیشەسازی، جیاوازی چینایەتی، تێکدانی شیرازەی خێزان، قەرزاری ئابووری وداگیر کردن وچەوساندنەوە، سەپاندنی یاسای بەد ڕەوشتی، لەناوبردنی کەلتورو داب ونەریتی ڕەسەن، دژایەتی کردنی ئاین وبیروباوەڕی کۆمەڵگە...هتد.

لەو چەند لاپەڕەی داهاتوو باسی چۆنیەتی سەرهەڵدانی کێشەی مافی ئافرەتان دەکەین لە وولاتانی جیهانی ئیسلامی بە پاڵپشتی نۆکەرەکانی ئەوکاتی ڕۆژئاوا، چۆنیەتی بەرنامە ڕێژیان بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئاین وداب ونەریت وکۆمەڵگە.

## بەندی یەکەم: میسر

مێژووی سەرهەڵدانی ئەو بیرۆکەیە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی نۆزدەهەم کاتێ روفاعە طهطاوی [1] پاش تەواو کردنی خوێندنی لە فەرەنسا گەڕایەوە میسر، دەستی کرد بەو جۆرە بانگەوازانە، بەڵام لەبەر ئەوەی خەڵکەکە تا ڕادەیەکی باش پەیوەست بوون بە ئاین وداب ونەریتی ڕەسەن، ئەوا بانگەوازەکەی هەرەسی هێناو لە شوێنی خۆی کپ بۆوەو سەری نایەوەو لەگۆڕنرا.

پاشان یەکێکی تر بە ناوی (قاسم أمين) [2] ئەو بانگەشەی دەست پێکردەوە، کە گەنجێکی میسری بوو، چووە فەرەنسا کولێژی یاسای تەواو کرد، هەر لەوێ ئافرەتێکی فەرەنسی لە خزمەتی دابوو، تاکو گۆشی بکات بە فەرهەنگ وڕۆشنبیری

---

1ـ الطهطاوي: رفاعة رافع بن بدوي: لە شاری تەنتا لە دایك بووە سالی 1801ز، لە ئەزهەر خوێندوویەتی، لە پێشەنگەکانی ڕاپەڕینی میسرە، لە فەرەنسا خوێندنی تەواو کردووە، کاتی گەڕاوە ڕۆژنامەی (الوقائع المصرية) دامەزراند، زۆر کتێبی لە فەرەنسیەوە کردۆتە عەرەبی، وەك: (تعريب قانون المدني للفرنساوي). الزركلي، الأعلام، 27/3.

2ـ محمد قطب، قضية تحرير المرأة، الرياض، دار الوطن للنشر، 1410هـ/1990م، ص12. باسی ژیانی قاسم ئەمین و هەندێ لە ناوەڕۆکی کتێبەکانی کراوە، کەوا چلۆن هێرشێکی ناڕەوا دەکاتە سەر ئاینی ئیسلام لە کتێبی دانەر (پیاوان وژنان تەوکاری نا یەکسان).

ئەوروپی. دوای گەڕانەوەی بۆ میسر دەستی کرد بە هێرش بردنە سەر ئاین وداوای لابردنی سەرپۆش وتێکەڵاوی کوڕی کچی کرد، کتێبی ئازادی ئافرەتی(تحرير المـــرأة) ی دانا، بە پاڵپشتی سەعد زەغلولی بەناو شۆڕشگێڕی ئەو کاتی میسر[1] ، کە هەردەم هانی دەداو پێی دەگووت: (لەسەر ڕێگەکەت بەردەوام بە، پشتت دەگرم ودەتپارێزم)، دوایی کتێبێکی تری دانا بەناوی ئافرەتی نوێ (المرأة الجديدة).

وێنەی هاوەڵایەتی ئەو چەواشەکراوە لەگەڵ سەعد زەغلول هەروەك وێنەی بێ باوەڕەکان وایـــە کە خوای گەورە دەربارەیان دەفەرمووێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ إِلَّا تَفْعَلُوهُ تَكُن فِتْنَةٌ فِى ٱلْأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ ﴾ الأنفال: 73.

لە کتێبەکانی زۆر بە ڕاشکاوی داوای داکەندنی سەرپۆش وپۆشاکی ئیسلامی و فڕەدانی دەکات، پاش ئەو ململانەی نێوان ئەوان وزانایانی ئەو کاتی میسر کێشەیەك دروست بوو بەناوی کێشەی ئافرەتان یان سەربەستی وئازادی ئافرەتان. لە یەکێك لە کتابەکانی دەڵێ: من هیچ گومانم لەوەدا نیە کەوا ئەو بزوتنەوە بچوکەی ئافرەتان، پاش ماوەیەکی تر دەبێتە گەورەترین ڕووداو لە مێژوویی میسردا.

لە کتێبی (الموسوعة الميسرة في الأحـــزاب والمـــذاهب المعاصـــرة) دەربارەی بانگەشەی ئازادی ئافرەت دەڵێ: ئەوە بزوتنەوەیەکی عەلمانیی– بێ دینیە– لە میسر سەری هەڵدا، دوایی زۆربەی وڵاتانی تری ئیسلامی گرتەوە، ئامانجی ئەوەیە ئافرەت پەیوەندی بـبڕێ بە هەموو داب ونەریتی کۆمەڵایەتی و خووڕەوشتی ئیسلامی و حوکمەکانی شەرعی، وەك: خۆداپۆشین، تێکەڵاوی، چەند ژنی، شوێنکەوتنی ئافرەتانی ڕۆژئاوا لە هەموو شتێکدا. کتێبی (ئافرەت لە ڕۆژهەڵاتدا– كتاب المرأة في الشرق) کە دانەرەکەی پارێزەرێکی نەصرانی میسریە، بەیەکەم کتێب دادەنرێ لەو

---

1 ــ سعد إبراهيم باشا زغلول: لە سالی 1857ز، لە شاری ئیبانەی ڕۆژئاوای میسر لەدایك بووە، سالی 1874 چووەتە ئەزهەر، پەیوەندی هەبووە لەگەڵ جمال الدين ئەفغانی ومحەمەد عەبدە. لە ڕۆژنامەی (الوقائع المصرية) کاری کردووە، لە سالی 1882ز لە شۆڕشی ئەحمەد عورابی بەشداری کردووە، چەند پۆستی وەزاری وەرگرتووە، لە دوایی بووە سەرۆك وەزیران لە سالی 1924ز، لە سالی 1926 کۆچی دوایی کردووە. سەرۆکی شاندی میسر بووە کاتی دانوساندنەکان بۆ سەربەخۆیی میسر لە سالی 1919ز. للزركلي، الأعلام، 3/83 .

بارەیەوە، لەدوای ئەو کتێبەکانی قاسم ئەمین دێت، کە ئەمانە بە ڕاشکاوی داوای ڕووتی وتێکەڵاوی، دەرچوون لە یاسا وڕێساکانی ئیسلام ودژایەتی کردنی دەکەن. ئامانجی دوورخایەنی ئەو بزوتنەوە بریتیە لە گۆڕینی کۆمەڵی ئافرەتان وکۆمەڵگەکانی ئیسلامی بۆ کۆمەڵگەیەکی عەلمانی – بێ دینی یە.[1]

**لە ئەندامە بەرزەکان ودامەزرێنەرەکانی ئەو بزوتنەوەیە لە میسر:**

1- **سەعد زەغلول:** سەرۆکی پارتی وەفدی میسری.

2- **ئەحمەد لوتفی سەید:** سەرنووسەری ڕۆژنامەی(الجريدە) کە بەناوی پارتی (الأمة المصري) دەردەچوو.[2]

3- **صەفیە زەغلـول:** خێزانـی سـەعید زەغلـول، کـە کـچی موسـتەفا پاشـای سـەرۆك وەزیران بوو.

4- **هدی شەعراوی:** کچی موحەمەد پاشا بـوو، خێزانـی عـەلی پاشـا، کـە لـە ئەندامـە بەرزەکانی (حزب الأمـــة). ئـەو عـەلی پاشـایە دەسـتی ئینگیـزی گـرت بـۆ هاتنـە نـاو قاهیرەی پایتەخت.[3]

5- **ئەمینـە سـەعید:** لـە قوتابیـەکانی طـە حوسـێنە، خـاوەن ئیمتیـازی گۆڤـاری (الحواء)یە. کە زۆر بە ڕاشکاوی هێرش دەکاتە سەر سەرپۆش وپۆشاکی ئیسلامی، لە یەکێك لە ووتەکانی دەڵێ: چۆن گوێ بدەینە ئەو چوار فەقیهانـەی کـە لـە سـەردەمی تاریکی ژیاون، ئێمـە ئێسـتا پـەیمانی ترمـان هەیـە لەسـەری بـڕۆین. (مەبەسـتی لـە –

---

1 ــ الجهني، الموسوعة الميسرة، 457/1، وما بعدها.

2ــ أحمد لطفي السيد: لە شاری بەرتین لە میسر لە دایك بووە سـالی 1870ز، لە قوتابخانـەی مـاف لـە قاهیرە دەرچووە سـالی 1890ز، کـاری پارێزەرایـەتی کـردووە، لـە چـەند پارتـەك کـاری کـردووە، چـەند جـاریش پۆستی وەزارەتی وەرگرتووە. یەکەم کەس بوو ئافرەتی ناردە زانکۆی تێکەڵاو. الزركلي، الأعلام، 200/1.

3 ــ هدی شعراوي: کچی موحەمەد پاشایە، لە سالی 1879ز لە دایك بووە لـە شـاری میـنای میـسری. لـە سالی 1919ز، لـە خۆپیـشاندان یەکـەم ئـافرەت بـوو کـە پۆشـاکی شـەرعی فـڕەدا، لـە سـالی 1923ز، یەکیـەتی ئافرەتـانی دامەزرانـد، بەشـداری چـەند کۆنگرەیـەکی ئافرەتـانی جیهـانی کـردووە. لـە سـالی 1947ز مـردووە. الزركلي، الأعلام، 78/8.

پەیمان– ئەو پەیمانەی کە جەمال عەبدولناصری سەرۆکی ئەوکاتی میسر مۆری کردبوو لەگەڵ سۆڤیەتی ئەوکات، کە میسر بکاتە وولاتێکی ئیشتراکی).[1]

6- ئەوال سەعداوی: سەرۆکی یەکیەتی ژنانی ئێستای میسری.

پاش ئەوەی قاسم ئەمین وسەعد زەغلول بیرۆکەی ئازادی ئافرەتیان چەسپاند، ئەوا هەدی شەعراوی خۆی گەیاندە ئەو کاروانە، پاشان کردیانە سەرۆکی (ڕاپەڕینی ئافرەتان – النـهضة النسوية)، لە ماڵی خۆی شوێنەکی تایبەتی جیاکردەوە، تاوەکو لەو شوێنە بە تەنها لەگەڵ پیاوان دانیشێ بە پۆشاکی ئەوروپی.

هەر لەو کات یەکیەتی وکۆمەڵە بۆ ئافرەتان دامەزرێنرا، یەکەم چالاکیان بریتی بوو لەوەی لە ساڵی 1919ز، خۆنیشاندانیان سازکرد لە گۆڕەپانی کۆشکی نیل(ئیسماعیلیە) بەرامبەر بە بنکەکانی سوپای ئینگلیزی. لەو کاتەی ئەو ئافرەتانە ئەو خۆپیشاندانەیان ڕێکخست، شۆڕشی میسری دژی داگیرکەرانی ئینگلیز بەردەوام بوو، ڕۆژانە خەڵکان دەهاتنە سەر شەقامەکانی قاهیرە، داوای ئەوەیان دەکرد کەوا داگیرکەران میسر جێبهێڵن، یان چاوەڕوانی مردن بکەن. داگیرکەرانیش وەڵامی ئەو خۆنیشاندانەیان دەداوە بە گوللەی تۆپهاوێژەکانیان وئاراستەی سینگی گەنجەکانیان دەکرد، ڕۆژانە دەیەها کوژراوو سەدەها بریندار دەبوونە قوربانی. لەو کاتە ناسکەوە صەفیە زەغلول هەڵسا بەسازدانی ئەو خۆنیشاندنە بەرامبەر بنکەی سەربازی کۆشکی نیل، دەستیان کرد بە داکەندنی پۆشاکەکانیان، نەوتیان پیداکردوو سووتاندنیان وهاواریان دەکرد ئافرەت ئازاد بوو .[2]

ئێمەش دەپرسین پەیوەندی چیە خۆپیشاندان دژی مانەوەی سوپای بێگانە لەگەڵ لابردن وسووتاندنی پۆشاکی ئیسلامی؟ ئایا ئینگلیز خۆداپۆشینی لەسەر ئەو ئافرەتانە واجیب کردووە تاوەکو نارەزایی بەرامبەریان دەرببڕن؟ یان ئەو کارە پێشتر بەرنامە

1 ــ أمينة سعيد: 1914 ــ 1995م، نووسەرێکی میسریە، لە ڕۆژنامەکان کاری کردووە، ئەو دوو کتێبەی هەیە (وجوه في الظلام) (ومن وحي العزلة). المنجد في الأعلام، ص 301.

2ــ محمد قطب ، قضية تحرر المرأة ، ص22.

ڕێژی بۆ کرابوو، تاوەکو بیسەلمێنن بەرامبەر بە سوپای دوژمنان، پێیان ڕابگەیەنن: ئەوا ئێمە وەك ئافرەتانی میسر دژایەتی خۆمان بەرامبەر بە ئیسلام ڕاگەیاند، ئەو بەرنامانەی کە ئێوە بۆمانتان داڕشتبوو هەمووومان جێبەجێ کرد، ئەگەر ئێوەش بڕۆنەوە وولآتی خۆتان، ئەوا ئێمە ئەو توانایەمان هەیە لەجیاتی ئێوە دژایەتی ئیسلام بکەین، ئەوە بۆمان سەلماندن بە کردار.

ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین سوپای داگیرکەران لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی لە هیچ وولآتێکی ناوچەکە هێزەکانیان نەکێشاوەتەوە تاوەکو کەسایەتی ڕامیاری وایان لەناو کۆمەڵگەی ئەو وولآتانە دروست نەکردبێت کە دوای کێشانەوەی هێزەکانیان ئەو سەرکردە پەروەردەکراوو گۆشکراو بە بەرنامەی ئەوان شوێنیان نەگرنەوە، تاوەکو لەجیاتی ئەوان کارو بەرنامەکانی دژ بە ئیسلام وکۆمەڵگە جێبەجێ بکەن، هەروەك لە میسرو عێراق وجەزائیرو ئێران وتورکیا ووولآتانی تر دەیبینین وباسیان دەکەین.

هەر ئەوجۆرە کەسایەتیانە بوون نازناوی پاڵەوانی نەتەوەیی و سەرکردەی ئازادی و سەربەستیان پێبەخشرا لەلایەن ڕۆژئاوا، کارو کردەوەکانی دژ بەئیسلامیشیان بە پاڵەوانیەتی و ناودەبرد.

لە هەمان کات ڕۆژنامەکانی بەکرێگیراو هەموو ڕاستیەکانیان ئاوەژوو دەکردە، کارە دژ بە ئاین و ڕەوشت بە ئازادی وسەربەستی ناودەبرد، بنەماکانی ئیسلامیشیان بە کۆنەپەرستی وتاریکی ناودەبرد.

هەروەك لە پرۆتوکولی حەوتەمدا هاتووە: پێویستە حکومەتەکانی غوییم (جگە لە یەهود- الغوییم) ئەو بەرنامەیە بگرنەبەر کە ئێمە بۆمان داڕشتوون زۆر بە وردی وفراوانی، ئەو بەرنامەیەش نزیکە لە تەواوبوون وگەیشتنە ئامانج. بەرنامەی کاری ئەو حکومەتانە لەسەر ئارەزووی ئێمەیە، ئەو شەپۆلەی کە پێی دەڵێن (ڕای گشتی- الرأي العام)، ئەوە سەری پەتەکەی لەبەر دەستی خۆمانە، کە دەیجوولێنین بەهۆی هێزی گەورە، ئەو هێزە گەورانەش بریتین لە ڕۆژنامەکان، زۆربەی ڕۆژنامەکانیش لەبەر

دەستی خۆمانە تەنها چەند دانەیەکی کەمیان نەبێ، ئەوانی تر هەموویان گوێڕایەڵی فەرمانی ئێمەن، هەرچیەکیان بۆ ئامازە بکەین هەر ئەو جێبەجێ دەکەن.[1]

هەروەها دەربارەی ڕۆژنامەکان پرۆتۆکۆلی دووانزەهەم ئامازە دەکات: ڕۆڵی ڕۆژنامەکان چیە ئیمڕۆ؟ ئایا تەنها کاریان وروژاندی کێشەکان وهاندان وبزواندنی سۆزو عاتیفەی خەڵك نیە، کە هەمووی خزمەتی ئامانجەکانی ئێمە دەکات؟[2]

هەروەها ئەوەش لە یاد نەکەین کەوا داگیر کردنی میسر لەلایەن فەرەنسیەکان بە سەرکردایەتی ناپلیۆن بۆنابارت[3] لە سالی 1798ز، کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر لێکخشان وئاشنابوونی کۆمەڵگەی عەرەبی بە ڕابوونی پیشەسازی ئەوروپی. ڕۆڵی موحەمەد عەلی پاشا [4] لەیاد ناکرێت کەوا دەیویست هەموو بیرو ڕۆشنبیری ئەوروپی بهێنێتە ناو کۆمەڵگەی میسری، بەهۆی ناردنی ژمارەیەکی زۆر لە قوتابیان بۆ خوێندن لە ئەوروپا.

هەروەها جەمالەددین ئەفغانی [5] وشێخ موحەمەد عەبدە [6] ڕۆڵێکی سەرەکیان

---

1 ــ عجاج نويهض، بروتوكولات حكماء صهيون، 213/2.

2 - عجاج نويهض، بروتوكولات حكماء صهيون، 232/2.

3ــ نابليون بونابارت: (1769ــ 1821م) ئیمپراتۆری فەرەنسا بووە لە سالی 1804– 1815ز، سەرکردەی سوپای فەرەنسی کرد بۆ داگیرکردنی میسر سالی 1798ز، لە جەنگی ئەهرام سەرکەوت بەسەر سوپای میسری، لە سالی 1804ز یاسای میللی دانا، هەموو ئەوروپا دژی وەستا لە شەڕی واتەرلۆ تێکشکاو، گیراو دوورخراوە بۆ دوورگەی سنت هیلانا وهەر لەوێش مرد.
المنجد في الأعلام، ص567.

4 ــ محمد علي: لە یۆنان لە دایك بووە لە سالی 1769ز، بوەتە والی میسر لە سالی 1805ز، سوودانی گرت، خاوەنی ڕابوونی زانستی وڕۆشنبیری وکشتوکاڵی میسر بوو . المنجد، ص 524.
الزركلي، الأعلام، 299/6

5 ــ جمال الدين الأفغاني: لە کابول لەدایك بووە لە سالی 1838ز، زۆر گەڕاوە لە وولاتانی ڕۆژهەلات وڕۆژئاوا، بانگی یەکگرتنەوەی وولاتانی ئیسلامی دەکرد، لەگەڵ شێخ موحەمەد عەبدە گۆڤاری (العروة الــوثقى) دەرکرد لە پاریس سالی 1884ز، سالی 1897ز مردووە. المنجد في الأعلام، ص57

6ــ محمد عبدة: لە بنەماڵەی ئال التركماني. موفتی میسر بووە، لە پیاوانی چاکسازی بووە، لە سالی 1849ز، بیری ئەو پیاوە لە دوو بەش پێکهاتووە: یەکەمیان، بانگەشە بۆ ڕزگاربوون لە بیری چاولێکەری، -

هەبوو لە هەوڵدان بۆ شوێنکەوتنی ئەوروپی وگەیشتنە کاروانی ڕۆشنبیری ڕۆژئاوایی. بەداخەوە هەردووکیان ئەو خەونەیان نەهاتەدی ومردن، لە دوایی مردنیان بەچەند ساڵێك دەرکەوت کەوا جەمالەددین ئەفغانی داردەست ونۆکەری بێگانەیەو لە فەرەنسا بۆ ئەو کارانە پەروەردە کرابوو.

**دووەم: تورکیا**

دوای سەرکەوتنی هەوڵەکانی گۆڕینی کۆمەڵگەی ئیسلامی لە میسر بۆ عیلمانی، ئەو بیرۆکەیە پەلی هاویشت بۆ وولاتانی تر. ئەوەتا لە ساڵی 1925ز، بڕیاردرا کەوا سەرپۆش وپۆشاکی ئیسلامی لە تورکیای نوێی دیموکراسی قەدەغە بکرێت بەسەرپەرشتی پاڵەوانی عیلمانی ئەتاتورك، هەروەك لە یەکێك لە ووتارەکانیدا دەڵێ: ئەی ئافرەتی تورکیا سەرپۆشەکەت داکەنەو تەماشای دونیا بکە.[1] چۆن ئەتاتورك سەرپۆش قەدەغە ناکات، ئایا هەر ئەو نەبوو خەلافەی ئیسلامی لەناوبرد ومیدالیای پاڵەوانی نەتەوەیی وەرگرت؟

هێنی هارۆڵد دەربارەی ئافرەتی تورکیا دەڵێ: کاتێ لە تورکیا خۆداپۆشین قەدەغە کرا، سەرەتا ئەنجامێکی پێچەوانەی هەبوو، چونکە ئەوانەی ئەو بڕیارەیان دەرکرد، ئامانجیان تەنها ڕووتی وتێکەڵاوی بوو، بەڵام لەو کات خەڵکان وایان بە چاك زانی نەهێڵن ئافرەتەکانیان هەر بچنە دەرەوە بۆ دژایەتی ئەو بڕیارە.[2]

ئەوە لەسەرەتای دەست پێکردنی ئەو هەوڵە بوو، بەڵام دوایی هەوڵەکان سەریان گرت، تورکیا بەرەو دوورکەوتنەوە لە ئاین و ڕەوشت وداب ونەریت هەنگاوی هەڵگرت، تەنها بۆ ئەوەی ڕەزامەندی وولاتانی ئەوروپی بەدەست بهێنێ وگوایە بەرەو پێشکەوتنی

---

=دووەمیان: حکومەت مافی بەسەر خەڵکەوە هەیە ئەویش گوێڕایەڵی کردنە، مافی خەڵکیش بەسەر حکومەتیش ئەوەیە کە یەکسانی بکات لە نێوانیان. لە گۆڤاری (الوقائع المصرية) و (العروة الوثقى) کاری کردووە، لە شۆڕشی عورابی بەشداری کردووە. کتێبی (تفسير القرآن الكريم)، (رسالة التوحيد)ی هەیەو، لە ساڵی 1905ز مردووە. الزركلي، الأعلام، 252/6.

1ـ هين هارولد، حياة المرأة الكردية، ص401.

2 ـ هينى هارولد، ص402. (نقلاً عن ريكارد).

ئابووری وکۆمەلایەتی دەڕوات، بەلام بەداخەوە تاوەکو ئێستا وولاتانی ئەوروپی پێیان ڕەوا نیە تورکیا هەربچێتە ناو بازاری ئەوروپی هاوبەش، هەروەها وولاتەکەیان لە ژێر قەرز دەنالێنێ وئەو پێشکەوتنە ئابوری وتەکنۆلۆژیەی بەخۆوە نەدیووە، بەبەراورد لەگەلّ ئەو پێشکەوتنە بەد ڕەوشتیەی کە تیایدا بلاوبۆتەوە.

کێشەی ئازادی ئافرەت لە تورکیا سەرەتای سەدەی بیستەم دەستی پێکرد سالّی 1909، پاش لادانی سولتان عەبدولحەمید لە خەلافەت وئیعلان کردنی دەستووری تورکی نوێ. یەکەم ئافرەت بانگەشەی ئەو بیرۆکەی کرد خالیدە ئەدیب بوو،[1] وەك سەرکردەیەکی ئافرەتانی تورك دەستی کرد بە نووسینی ووتاری ڕامیاری وهەولدان بۆ ئازادی ئافرەت. ئەو ئافرەتە خۆی دەرچووی کولێژی کچان بوو (كلية البنات الأمريكية)، لە ئەمەریکا ژیاوەو خوو ڕەوشتی ئەوانی وەرگرتبوو.

لە سەرکردەکانی تری بیرۆکەی ئازادی ئافرەتان خاتوو لوتفیە[2] بوو، پاش ماوەیەك ئەتاتورك خوازبێنی کرد، لە سالّی 1925ز، دەستی کرد بە دامەزراندنی کۆمەلّەو یەکیەتی ئافرەتان، وەك: یەکیەتی ئافرەتان، یەکیەتی مامۆستایان، کۆمەلّەی پێشکەوتنی کارەدەستیەکانی ئافرەتان...هتد

**سێیەم: ئێران**

یەکەم سەرکردەی بیرۆکەی ئازادی ئافرەتان لە ئێران زوهرە حەیدەری بوو، لە سالّی 1927ز، چووە ئەمەریکاو هەندێك ووتاری پێشکەش کرد لە زانکۆکانی ئەمەریکا دەربارە ئافرەتانی ئێران، پاشان داواکرا لە شای ئێران[3] دان بە ئازادی ئافرەتان دابنێ بە شێوەیەکی ڕەسمی لە سالّی 1939ز.[4]

---

1 ـ عمر رضا كحالة، المـرأة في عالمي العرب والإسلام، 257/1.

2 ـ عمر رضا كحالة ، المـرأة في عالمي العرب والإسلام، 127/1.

3ـ محمد رضا شاه (1919- 1979). کوڕی ڕەزا شایە، لە سالّی 1941ز، شوێنی باوکی گرتەوە، ئیمام خومەینی لە سالّی 1979ز، لەسەر کورسی حوکم لایدا وهەلات بۆ میسر هەر لەوێ مرد. المنجد في الأعلام، ص141.

4ـ كحالة، المرأة في عالمي العرب والإسلام، 138/1.

لە ساڵی 1932ز، لە تارانی پایتەخت کۆنگرەیەکی ئافرەتان بەسترا بۆ لێکۆڵینەوە لە کاروباری ئافرەتان، ئەو کۆنگرەیە ڕەزامەندی شای ئێرانی بەدەست هێناو بەڵێنی هاوکاری پێدان.

ئافرەتانی ئێران بەشداریان کرد لە کۆنگرەی ئافرەتانی جیهانی کە لە ساڵی 1935ز، لە ئەستانبۆل گیرا.[1]

لە ساڵی 1936ز، سەرپۆشی ئیسلامی قەدەغە کرا، یەکەم جار لە کۆچەو کۆڵانەکان، دوایی لە شەقامە سەرەکیەکان، پاشان لە هەموو ناوچەکانی پایتەخت. لە کۆتایدا قەدەغەکرا ئافرەت بەسەرپۆش وخۆداپۆشینەوە بێتە دەرەوە لە هەموو شوێنەکان، ئەو بڕیارە تەنها سێ هەفتەی خایاند. لەهەمان ساڵ شای ئێران بڕیاریدا هەموو بازاڕەکان پڕ بکەن لە پۆشاکی دیزان ئەوریی وبفرۆشرێ بە نرخێکی کەم، تاوەکو خەڵکان زووتر وزیاتر بیکڕن.[2]

یاسای لەبەرکردنی پۆشاکی کورت بۆ کچانی قوتابخانەو زانکۆکان و ئافرەتەکانی بەڕێوەبەراتیەکان لە ساڵی 1954 بڕیار درا بە شێوەیەکی ڕەسمی، ڕاستەوخۆ دوای گەڕانەوەی شای ئێران لە تورکیا، کە خۆیی وخێزانی وکچەکەی بانگێش کرابوون بۆ بەشداری لە کردنەوەی پەیمانگەی سەرەتایی هونەرەکان، لەو ئاهەنگەدا هەموو وەزیرەکان وخێزان ومنداڵەکانیان بەشدار بوون، مەرج بوو تیایدا کە هەموویان بەجلی کوورت بن وپۆشاکی درێژ تیایدا قەدەغە بوو. لەو ئاهەنگە ڕەزا شای ئێران لە ووتارەکەیدا گووتی: ئێمە قەفەسە ئاسنینەکانی بەندیخانەکانمان شکاند، بۆیە پێویستە لەسەر ئەو ئافرەتانەی لەو بەندیخانەیە دەربازیان بووەماڵێکی تر بۆ خۆیان ڕێکبخەن لە جیاتی بەندیخانە. پاش ئەوەی ڕەزا شا گەڕاوە، خۆداپۆشین لە هەموو شارەکانی تری ئێرانی قەدەغە کرا، چونکە پێشتر تەنها لە پایتەخت بوو. هەروەها فەرمانی دەرکرد نابێ هیچ یەکێك لە پیاوانی پۆستە بەرزەکانی ووڵات خۆیی وخێزانی پۆشاکی کۆن بپۆشێ بەتایبەتی کاتی ئامادە بوونی لای شا بۆ بۆنە تایبەتی و گشتیەکان.[3]

---

1ــ کحالة، المرأة فـي عالمي العـرب والإسلام، 140/1.
2 ــ هین هارولد، حیاة المرأة الکردیة، ص402.
3ــ دروزة ، محمد عزة ، المـرأة في القرآن والسنة ، ص11.

### چوارەم: جەزائیرو یۆگوسلافیا

لە ساڵانی پەنجاکان ئەحمەد بین بیلای سەرۆکی جەزائیری[1] ئەو کات لەیەکێك لە ووتارەکانی گووتی: داوا دەکەم لە هەموو ئافرەتانی جەزائیر حیجاب فرێ بدەن لە پێناوی جەزائیر.[2]

دەپرسین ئایا جەزائیر چ سوود وەردەگرێت لەو پۆشاکانە کاتێ فرەدران؟ ئایا چەکی پێدەکرێت بۆ بەریەرەکانی دوژمن؟ یان فەرمانێکە پێی گووتراوە لەلایەن فەرەنساوە وپێویستە جێبەجێی بکات، بەڵام ئەو داماوە نەیدەزانێ چۆن ئەو فەرمانە دەربڕێ لەبەر چاوی خەڵك، چۆن ئەو فەرمانە ئەوروپیە بەرگێکی نەتەوەیی و ناوچەگەرێتی بۆ دابڕێژێ، ئەوەبوو گووتی: پۆشاکی ئیسلامی فرێ بدەن لە پێناوی وولاتی جەزائیر، هەرچەندە ئەو دوو بابەتە زۆر لێك دوورن. چونکە فڕەدانی جۆرێك لە پۆشاك نە فێربوونی زانستەو نە چەك دروست کردنەو نە هێرش بردنەو نە خەباتی رامیاری وسەربازیە، بەڵکو تەنها جێبەجێ کردنی فەرمانی گەورە پیاوانی ئەوروپیە، کە لە بنەڕەتدا دایانڕشتووە دژ بە نەتەوەکانی ڕۆژهەڵات وداب ونەریتەکانیان، هەروەها سەپاندی بیروبۆچوونی ئەوروپیە بەسەر وولاتانی بێ هێزی ئیسلامی یە بە زۆرداری و هێزی ترساندن و تۆقاندن.

لە ساڵی 1952ز، بە بریارێك لەلایەن جۆزیف تیتۆی کۆمونیست[3] بریاری قەدەغەکردنی خۆداپۆشین درا، هەر یەکێکیش سەرپێچی ئەو بریارە بکات ئەوا 3 مانگ لە بەندیخانە دەبێت.

---

1ـ أحمد بن بيلا: لە ساڵی 1919ز لە دایك بووە لە گوندێك نزیك وەهران، بۆتە ئەفسەر لە سوپای جەزائیر، بەشداری شۆرشی ڕزگاری کردووە، چەند جارێك لەلایەن فەرەنسیەکانەوە گیراوە، لە پارتی گەل کاری کردووە. لە ساڵی 1954ز شۆرشی چەکداری دژی فەرەنسا بەرپا کرد، بۆتە سەرۆك کۆمار پاش سەربەخۆیی ساڵی 1963ز، لە ساڵی 1965ز هەواری بومیدین شوێنی گرتەوە الموسوعة السياسية (89/1).

2 ــ هيني هارولد، حياة المرأة الكردية ، ص403.

3 ــ جوزيف بروز. مارشاڵێکی یۆگوسلافیە، لە ساڵی 1892 لەدایك بووە، بەرگری کردووە لە وولاتەکەی کاتی هێرشەکانی ئەڵمانی لە جەنگی دووەمی جیهانی، لە ساڵی 1945ز بۆتە سەرۆك کۆمار تاوەکو مردنی، یەکێکە لە دامەزرێنەرەکانی (دول عدم الانحياز). المنجد في الأعلام/ ص187.

هێنی هارۆلد دەڵێت: ئەگەر ئەو پاڵەپەستۆ وترس وتۆقاندنە نەبوایە لەسەر موسڵمانانی یوگوسلاڤیا ئەوا هەرگیز ئافرەتەکان پۆشاکی ئیسلامیان فڕێ نەدەدا.[1]

## پێنجەم: عێراق

لە هەمان کاتدا لە بەغدای پایتەختی عێراق هەمان بیرۆکە سەری هەڵدا، یانەو یەکیەتی ئافرەتان دامەزرێنرا، یەکەم کۆڕی ئەو ئافرەتانەی سەرکردەی ئەو بیرۆکەیە بوون ئەمانە بوون: ئەسمای زەهاوی بوو، کە خوشکی جەمیل صدقی زەهاوی شاعیرە.[2] نەعیمە خان خێزانی نوری سەعید[3]، خێزانی جەعفەر عەسکەری[4]، خێزانی یاسین هاشمی[5]، سەرکردایەتی ئەو کارە درا ئەسما زەهاوی وجێگرایەتیش بۆ

---

1 ــ هيني هارولد، حياة المرأة الكردية، ص401.

2ــ جميل صدقي الزهاوي: شاعیرێکی کوردە، لە هۆزی بابانە، لە ساڵی 1863ز، لە بنەماڵەیەکی زانست و بەرز بووە، لە پێشەنگی ڕابوونی ئەدەبی عەرەبیە، باسی خۆی دەکات ودەڵێ: لە منداڵیەوە: ناو بە شێت دەرچوو بوو چونکە جوولەی زۆر ناشرینم دەکرد، لە گەنجی بە سەرلێ شێولو ناوم دەرکردبوو چونکە هەردەم ئارەزووم بەرەو گۆڕانی ڕابواردن دەچوو، لە گەورەیی ناوم بە ئازاو چاونەترس دەرکرد چونکە زۆر دژی ئاکڕەوی بووم، لە پیری بە زەندیق وهەڵگەڕاوە ناوم دەرکرد چونکە بیری بێ دینی وفەلسەفیم هەبوو. شیعرەکانی لە 10 هەزار دێڕ زیاترە.لەدیوانەکانی: ديوان الزهاوي ونزعات الشيطان]. لە ساڵی 1936 مردووە. الزركلي، الأعلام، 137/2.

3 ــ نوري سعيد: (1898ــ 1958م). لە شاری بەغدا لەدایك بووە، ساڵی 1888ز، لە ئەستانە لە قوتابخانەی سەربازی دەرچووە ساڵی 1906ز، لەگەڵ شۆڕشی حیجاز بووە، شۆڕشی شەریف حوسێن، سەرۆکایەتی وەزیرانی عێراقی وەرگرت لەکاتی پاشایەتی فەیسەڵ یەکەم و غازی کوڕی وفەیسەڵ دووەم، ساڵی 1958ز کوژرا. المنجد في الأعلام/ ص301.

4 ــ جعفر بن مصطفى العسكري: لە شاری بەغدا ساڵی 1885ز، لەدایك بووە، لە بەغداو ئەستانە خوێندوویەتی، پلەی ئەفسەری وەرگرتووە، لەگەڵ شەریف حوسێن کاری کردووە ساڵی 1916ز، لە ساڵی 1924ز، بووە سەرۆك وەزیرانی عێراق، لە ساڵی 1935ز، بەکر صیدقی کوشتی لە ساڵی 1935ز لە کودەتایەکی سەربازی. الزركلي، الأعلام ، 129/2.

5 ـ یاسین بن حلمی الهاشمی:لەبەغدا لەدایك بووە، لەساڵی 1882ز، لەئەستانەو بەرلین خوێندویەتی، ، لەساڵی 1905،ز، پلەی ئەفسەری وەرگرتوە،لەساڵی 1916ز، چووە لای شەریف حوسێن، ساڵی 1922ز، هاتەوە عیراق،چەند وەزارەتەکی وەرگرت،چەند جارێکی تریش بۆتە سەرۆك وەزیران، پاش کودەتای سەربازی صدیقی هەڵاتچووە لوبنان و هەرلەوێ مرد. الزركلي، الأعلام، 8/ 128.

نەعیمە خان.[1]

دەبینین زۆر بەئاشکرا فەرمانڕەواکانی ئەوکاتی ناو وولاتانی ئیسلامی هاوکار بوون بۆ جێبەجێ کردنی بەرنامەکانی ڕۆژئاوا بۆ شێواندنی کۆمەڵگەکانی ئیسلامی، ئەگەر ئەو هاوکاریەو نۆکەرایەتیەو ترس وتۆقاندنە نەبوایە هەرگیز نەیاندەتوانی بەرنامە ژەهراویەکانی خۆیان بەسەر کۆمەڵگە ئیسلامەیکاندا بسەپێنن. هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتُ بَعۡضُهُم مِّنۢ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمُنكَرِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَقۡبِضُونَ أَيۡدِيَهُمۡۚ نَسُواْ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمۡۚ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴾التوبة 67.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ نَافَقُواْ يَقُولُونَ لِإِخۡوَٰنِهِمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ لَئِنۡ أُخۡرِجۡتُمۡ لَنَخۡرُجَنَّ مَعَكُمۡ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمۡ أَحَدًا أَبَدٗا وَإِن قُوتِلۡتُمۡ لَنَنصُرَنَّكُمۡ﴾الحشر 11.

**خوێنەری بەڕێز:**

لەوانە بپرسی وبڵێیت ئەو سەرکردەو فەرمانڕەواو کاربەدەستانەی وولاتانی جیهانی سێیەم بەگشتی وولاتانی ڕۆژهەلات بەتایبەتی مافی خۆیان بووە کەوا هەوڵ بدەن ئافرەتان بەرەو پێشەوە ببەن، قوتابخانەیان بۆ بکەنەوە تاوەکو فێری خوێندن ببن وئاگادارو شارەزایی پەیدا بکەن لە ژیان ودەوروبەر بەهۆی ئەو خوێندنە. ئەمە شتێکی ڕەوایە وپێویستیەکی زۆر پێویستەو ئەرکێکی ئیسلامیشە، یەکەم لەسەر باوکەکان کە لێپرسراون لەوەی منداڵەکانیان فێری خوێندن بکەن، دووەم لەسەر حکومەتیش پێویستە پێداویستی خوێندن لە هەموو ئاستەکان بۆ نەوەکانی دوا ڕۆژی دابین بکات. بەلام ئەوەی جێگەی سەرسوڕمان وپرسیار کردنە، ئایا پۆشاك چ پەیوەندی هەیە لەگەڵ خوێندن وفێربوون و وەرگرتنی زانست؟ ئایا زانست دەچێتە ناو گیرفان و

1 ــ كحالة، المرأة في عالمي العربى والإسلامي، 122/1.

پۆشاك یان دەچێتە ناو مێشكەكی ئاسوودەو دەرونێكی پاك؟ ئایا ئەو وولاتانەی لە پۆشاك چاولێكەری شوێنكەوتەی ئەوروپا نەبوون لە زانست پێش نەكەوتوون؟ وەك هیندستان وژاپۆن وزۆر وولاتی تر كە تاوەكو ئێستا لەبەرزترین پۆستە تاوەكو نزمترین پۆستەی كە بە ئافرەتان دراوە، دەبینین هەر پۆشاكی نەتەوەیی خۆیان دانەكەندووەو دژایەتیشان نەكردووە. ئەی بۆ دەبێت تەنها وولاتانی ئیسلامی پێش ئەوەی یەك پیت ویەك ووشە فێری منداڵەكانمان بكەن دەڵێن دەبێت جۆری پۆشاكت بگۆڕی و دژایەتیشی بكەیت ئەگینا نابیتە خوێندەوارو ڕۆشنبیر. ئایا ئەوە بەرنامەی دژایەتی ئیسلام نەبێ چ ناوێكی تری بۆ دەدۆزیتەوە؟ ئایا ئەو وولاتانەی لەسەر پۆشینی پۆشاكی خۆیان بەردەوامن پێشكەوتوو تر نین لە وولاتانی بەناو ئیسلامی؟ كەواتە پۆشاك ڕێگر نیە بۆ فێربوون، بەڵكو ئامانجی تر هەیە لە پشت ئەو كارو فەرمانانەوە. هەروەك بیستوومانە لە سەردەمانی كۆن ولەسەدەی بیست وبیست ویەكەمیش دەبینین بە چاوی خۆمان زۆر لەو ئافرەتانەی خاوەكی پۆشاكی ڕەسەنن وشێوەو ڕوكارو بیرو هۆشی نەگۆڕیە ویە فەرهەنگی خەڵكانی تریش هەڵنەخەڵەتاون زۆر لە پێشتر بوونەو زۆر لە پێشترن لە ئافرەتانی تر لە هەموو ئاستەكانی زانست وكاركردن وداهێنان ودەست پاكی وكات بەفیڕۆ نەدان و خزمەتی كۆمەڵگەو نەتەوەو وولات. كەواتە دەبووایە ئەو سەركردانە خاڵی یەكەمیان وەرگرتابایە كە خوێندن وفێربوونە، بەڵام بەو مەرجانەی لەسەریان دانابوون ڕازی نەبوونایە، لەبەر دوو هۆ، یەكەمیان: چونكە بڵاوبوونەوەی نەخوێندەواری و دواكەوتنی ئافرەتان لە كەمتەرخەمی ئەوان بووە، بەوەی هەوڵیان نەداوە بۆ جێبەجێ كردنی ئەم كارە، دووەمیان: گۆڕینی كلتورو فەرهەنگ شتێكی زۆر ترسناكە، چونكە هەر نەتەوەك ئەو بنەمایانە وون بكات ئەوانە پێناسەی خۆشی وون دەكات و لەناو دەچێت لە كاتێكی دوور یان نزیك. هەروەك هەستی پێدەكەین لە توانەوەی زۆر لە نەتەوەو وولات لە دوورو نزیكمانەوە، لەگەڵ ئەوەشدا نەبوونەتە وولاتێكی پێشكەوتوو.

لە کوردستانی خۆمان ئافرەت لە ڕووی پۆشاك پۆشینەوە سەربەستە لە گشت ئاستەکانی خوێندن وزانکۆکان وفەرمانگەو وەزارەتەکان، هیچ جیاوازیەکیش بەدی ناکرێت لە ڕووی تێکەیشتنەوە لە نێوان ئەوانەی پۆشاکی ئەوروپی دەپۆشن وئەوانەی پۆشاکی ئیسلامی دەپۆشن، بۆیە جۆری پۆشاك بەبەرست نیە لە ڕێگەی فێربوون وکارکردن وخزمەت کردن و هەرگیز نابێتە بەربەستیش لە هیچ شوێنەکی جیهان.

**خوێنەری بەڕێز:** لە کاتی گێڕانەوەی مێژووی ئەو بابەتە وچۆنیەتی سەرهەڵدان وبڵاوبوونەوە و سەرکەوتنی لە ناو کۆمەڵگەکانی ئیسلامی دوو کۆمەڵ و دوو چین لە خەڵك زۆر بە زەقی دیارن، یەکەمیان: ئەو سەرکردەو سەرۆك وەزیرو وەزیرانەن بوون کەوا ئیستیعمار دیاری کرد بوون بۆ جێگەگرتنەوەیان پاش ئەوەی هێزەکانی خۆیان کشاندەوە، لە هیچ وڵاتێکی ئیسلامیش هێزەکانی ئیستیعمار نەکشاوەتەوە تاوەکو دڵنیا نەبێت کە ئەوەی شوێنی دەگرێتەوە لەخۆی زیاتر خزمەتی دەکات، چونکە ئەو سەرکردانە لەهەمان نەتەوەن و لەسەر هەمان ئاینی کۆمەڵگەکەیانن. خاوەنی ئەو بیروباوەڕە ئەوروپیانە چاودێریەکی تەواوی ئەو سەرکردانە دەکەن کە خۆیان دایانمەزراندون ، هەرکات بینیان لە خزمەتی بەرنامەکانی ئەوانن ئەوا چەندەها نازناوی گەورەیان بۆ دەڕازێننەوە، وەك پاڵەوانی نەتەوەی، ڕیکخەرو یەکخەری نەتەوەی عەرەبی، پاڵەوانی سەربەستی وئازادی، نوێکەرەوەو بوژێنەورەوەی ئیسلامی..هتد. ئەگەر بەو کارانەش هەڵنەسا بە شێوەیەکی باش، ئەوا هەزار ناوونائۆرەی بۆ دەدۆزنەوەو لەناوی دەبەن بەیەکێك لە کاربەدەستە نزیکەکانی یان پاسەوانەکانی. ئەو سەرکردانە ئەگەر کارەکانیان بۆ چووەسەر بە بێ کێشە ئەوا باشە، ئەگەر نا دەبینین چۆن هێزی سەربازی ودەسەلاتی ڕامیاری بەکار دەهێنن بۆ سەپاندنی بەرنامەکانی بیگانە تاوەکو ماوەیەکی زیاتر لەسەر کورسی دەسەلاتداری بمێننەوە، هەروەك بینیمان لە ئێران وتورکیاو یۆگوسلافیا.

چینی دووەم: ئەوانەن کە دەرچووی زانکۆکانی ئەوروپی وئەمەریکی بوون، کاتی چوون بەناوی خوێندن، لەو وڵاتانەی دەرەوە لە جیاتی زانستی سەربازی وتەکنۆلۆژی

وكۆمەڵایـەتی، گەڕانـەوە بـە بیروهۆشـێكی شـێواوی گۆشـكراو بـە كلتـورو فەرهـەنگ وڕەوشتی ئەوروپی، شەوڕۆژ بانگەشە بۆ فەرمانـەكانی ئـەوان دەكات هـەروەك تـووتی (ببغاء) چی ئەوان بڵێن هەر ئەوە دەزانـی بڵێتـەوە، لـەوە زیـاتر نـاتوانێ یـەك هـەنگاو بەرەو پێشەوە یان دواوە بڕوات. هەروەك بینیمان لە سەركردەكانی بـیری نەتەوایـەتی عەرەبی شۆڤینی، كە هەر هەموویان لە دەرچوانی زانكۆی ئەمەریكی بوون لـە لوبنـان، یان لە وڵاتانی تری ڕۆژئاوا.

**هۆیەكانی هەرەس هێنانی موسڵمانان بەرامبەر نیارەكان لە بابەتی ئازادی ئافرەتان (أسباب هزيمة المسلمين في قضية تحرير المرأة)**

1- كاربەدەستان وزانایانی ئاینی ئەو كات، ئافرەتیان لە كۆمەڵگە بێبـەش كردبـوو لـە خوێنـدن، بەشـداری كردنـی ئـەو چـالاكیانەی گونجـاوە بـۆی وەك: پـەروەردە وتەندروستی، كاروباری تایبەت وپەیوەست بەئافرەتان وهەندێ كاری تر، كە بە درێژی باسمـان كـردووە لـە كتێبـی (پیـاوان وژنـان تـەوكاری نـا یەكسان). ئـەو بۆشـاییی یـە ڕۆشنبیریە وای كرد دەرگای كۆمەڵگە واڵا بێـت بـۆ سـەركردەو بەرنامـە داڕێـژەرەكانی ئـەوروپی، ئـەو هەڵـەیان قۆزتـەوە بـۆ بەرژەوەنـدی خۆیـان وهاتنـە نـاو كۆمەڵگەیـەكی نەخوێنـدەواری نـا تێگەیـشتوو لـە ئـاین ولـە دونیـا، دەسـتیان كـرد بـە دامەزرانـدنی قوتابخانـە بـە گـوێرەی ئـەو بەرنامـەی خۆیـان دەیانەویـست، بـەناوی نەهێـشتنی نەخوێنـــدەواری، خزمـــەتگوزاری پزیـــشكی، خزمـــەتی هـــەژاران ..هتـــد. ئەوانـــەی سەرپەرشـتی ئـەو بنكـەو قوتابخانانـەیان دەكـرد زۆربـەی لـەو كەسـانە بـوون كـە پەروەردەیەكی تەواو كرابوون، ئاگاداری وئاشناییان هەبوو كەوا چۆن هەوڵدەدەن ئـەو كۆمەڵگەیانە لە ئاین و ڕەوشت دوور بخەنەوە.

2- سـووكایەتی كـرد بـە ئـافرەت لـە هەنـدێ لـە كۆمەڵگـەكانی بـەناو ئیـسلامی بەتایبەتی پاش ئەوەی خەڵك لە ئاین دووركەوتبوونەوە، بـەهۆی نەخوێنـدەواری، یـان كـەم ڕۆشـنبیری زانایـانی ئـاینی بـە زانـستی سـەردەم و فیقهـی واقیعـی. فـەرمان

وئایەتەکانی خواو فەرموودەکان جێبەجێ نەدەکران کەوا باسی مافی ئافرەت دەکات لە قۆناغەکانی ژیان، هەروەك باسیان دەکەین لەلاپەڕەکانی داهاتوو.

3- هەڵوەشانەوەی ئوممەتی ئیسلامی دوای نەمانی خەلافەتی ئیسلامی بەلادانی سوڵتان عەبدولحەمید لە ساڵی 1909ز، سڕینەوەی خەلافەت بە ووشەو بەکردار لەساڵی 1924ز. پاش شکستی تورکیا لە جەنگی یەکەمی جیهانی وولاتانی ئیسلامی دابەشکرا لەلایەن وولاتانی ئەوروپی لەسەر بنەمای نەتەوەگەری، کە تەنها کورد تیایدا بێبەشکرا. ئەو شکستە سەربازیە هەلێکی چاك وگونجاو بوو بۆ ئەوروپیەکان بۆ سەپاندنی فەرهەنگی خۆیان بەسەر خەڵکانی تر، کە لەو کات نەفسیەت وهیممەت وعەزیمەتی وولاتانی ئیسلامی داتەپی بوو، گەیشتبووە نزمترین ئاست.

4- بوونی ناکۆکی زۆر لە نێوان وولاتانی بەناو ئیسلامی، لەسەر بنەمای نەتەوەگەری ومەزهەبی وناوچەگەریەتی و کێشەی سنوورەکان وبەرژەوەندیەکان، وای کرد لە وولاتانی ئەوروپی زۆر بەئاسانی فەرمانڕەواکان بەکار بهێنن بۆ بەرژەوەندی خۆیان، هەروەها فەرهەنگی خۆیان پیادە بکەن لەناو کۆمەڵگەی ئەو وولاتانە بەبێ چاودێر ولێپرسینەوە، تەنها بەرامبەر بەوەی کەوا لەسەر کورسی فەرمانڕەوایی بیانهێڵنەوە.

5- دانان وبڕیاردانی توندترین سزا بۆ ئەو کەس ولایەن وسەرکردانەی کەوا دەنگی نارەزایی دەردەبڕن بەرامبەر بە کردەوە ناشیاوەکانی حکومەت وئەو بیگانانەی لەو وولاتانەدا کار دەکەن، هەروەك لەناوبردنی عەدنان مندریس لە تورکیا، موصەدەق لە ئێران، شا فەیسەلی سعودی، شەهید سەید قوتب و ضیاء الحقی پاکستانی و وزۆری تر. ئەوانە لە سێدارەدران یان کوژران بە نهێنی بە بیانوی ئەوەی ویستوویانە دەستووری وولات بگۆڕن، یان ویستوویانە خاوەن شکۆ لەسەر کورسی فەرمانڕەوایی دابەزێنن، یان گێرەشێوێنی دەکەن، یان دژایەتی دیموکراسی وپێشکەوتن وئیشتراکیەت دەکەن.

6- موسڵمانان دووربوون لەوەی کەسایەتی ئیسلامی ڕاستەقینە لە ژیانی تاك یان کۆمەڵ پیادە بکەن.

7- موسڵمانان لەناوەوە ڕوخابوون، گیانیان تیا نەمابوو، ڕمابوون، بەهۆی دوورکەوتنەوە لە گیانی ئاینی ئیسلام وبەرنامەکەی. هەرکات موسڵمان لە خوا دوور بوو ئەوا وەك مرۆڤێکی بێ گیانە بە ئاسانی شکست دەهێنێ، چونکە هەرکەسێك گیانی تیا نەبوو ئەوا بە مردوو دەژمێردرێ، بۆیە نەیان توانی بەرامبەر ئەو هێرشە فەرهەنگیە ئەوروپیە بێ بنەماو لەرزۆکە بووەستن بۆماوەیەکی درێژ. موسڵمانی بێ گیان ودوور لە قورئان، سەبروئارامی وخۆڕاگری کەمە، ناتوانێ ئەو پاڵەپەستۆیانەی لەسەریەتی هەرسی بکات وبیمژێ بە شێوەیەکی بەرنامە دارێژراو بەبێ ئەوەی کاریگەری سەلبیشی هەبێ لەسەر خودی خۆی. خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَـٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَـٰنُ وَلَـٰكِن جَعَلْنَـٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾الشوری: 52.

شەهید سەید قوتب دەڵێ: موسڵمانەکان وەستاون بەرامبەر دوژمنێکی زۆر زالم و بەهێز، ملهوڕو لووت بەرز بەسەرکەوتنەکانی، وەستاوە بەرامبەر بەو لێشاوە فەرهەنگیەی دەرگای شەهوەو ئارەزووی بۆکردۆتەوە، وەستاوە بەرامبەر ئەو داڕمان و بێ هێزی وبێ گیانیەی کە تیای کەوتوون، بەرامبەر ئەو تەماع و خۆشیانەی کە لە دونیا پێشکەشی دەکەن. بۆ وەستان بەرامبەر ئەو هەموو شتە، تێشوو وخۆراکیان باوەڕە بەخوایە، چەك وتفاقیان هەر خوایە، پاڵپشت وهیواو ئومیدیان هەر خوایە، چونکە هەموو خۆراکێك بێجگە لە خۆراکی ئیمان هەر تەواو دەبێت ونامێنێ، هەر پێداویست وچەکێك جگە لە چەکی باوەڕ هەر کۆل دەبێت ودەچەمێتەوە، هەر پاڵپشتەکیش بێجگە لە خوا هەر دەڕمێ ودەچەمێتەوەو دەکەوێت.[1]

1ـ سيد قطب، في ظلال القرآن، 448/1.

8- كاتێ هەندێ لە موسڵمانان ویستیان لـە فەرهـەنگی ڕۆژئـاوا وپێـشكەوتنەكانی سوود وەربگرن چوون بەدەم بانگەوازەكەوە، بەڵام نەیان زانی ئەوان تـەنها ڕووكەشـی پێشكەوتنەكانیان پـێ نیشاندەدەن، ڕێگـەنادەن بەكەسـی تـر سـوودیان لێـوەربگرێ، جگە لەوانەی لە چوارچێوەی خۆیانن، هەروەها نەیاندەزانی هەروەرگرتێك بێ بەرامبەر نیە، نەیان دەزانـی شـتە خـراپ وقەڵپـەكانیان پێـدەدەن، بـەڵام شـتە باشـەكانی وەك فێربـوونی پیـشەسازی، دروسـت كردنـی چـەك وكەلوپـەل وشـتەكانی تریـان لێ دەشـاردنەوە. هەربۆیـە نـەمان بینـی ئـەو وڵاتانـەی بـەناو ئیـسلامی یـەكیان بگەنـە لووتكەی زانستی سەردەم، لەگەڵ تێپەڕ بوونی زیاتر لە یەك سەدە بـە شـوێن كـەوتنی ڕۆژئاواو ڕاكردن بەدوای ئەو خەونە بەتاڵانەدا. ئەوەی پێیـان بەخـشین تـەنها نـاكۆكی ودووبەرەكی، بیری نەتەوایەتی كەخۆیان چەند سەدە پێوەی گیرۆدە ببوون، هـەروەها پێدانی بەرنامەو فەرهەنگی نەهێشتنی شیرازەی خێزان وخزمایـەتی وهاوكـاری، جێگـە گرتنەوەی ئەو بەها بەرزانە بە ڕابواردن وئارەزووبازی وبەرژەوەنـد پەرستی، تـاوەكو گەنج ولاوان لە هەردوو ڕەگـەز سـەرگەردان بكـەن بـە كـاری لابـەلا ودووربكەونـەوە لـە زانستی وڕۆشنبیری بەسوود.[1]

9- ڕازاندنـەوەی ئـەو بەرنامانـە بـەناوی پێـشكەوتن وشارسـتانیەت وئـازادی، بـە پاڵپشتی زلهێزەكان و هاوكاری فەرمانڕەواكان، بۆ كاركردن لە هەموو بوارەكـانی ژیـان بۆ شوێن كردنەوەی ئەو بەرنامانە لەناو كۆمەڵگە بەهەموو ئاستەكانیەوە. هـەروەك لـە پرۆتۆكولی هەشتەمەوە هاتووە: لەسەر ئێمە پێویستە بـە ئاسـكترین ووتـە، جـوانترین ووشـە، بـەكارهێنانی بـەرزترین پلـەی ووریـایی لـە شـێواندنی یاسـاكان وفـەتواكان، دارشتنی بڕیـارو یاسـای بەرژەوەندیـدار بەخۆمانـەوە، ئـەو بڕیارانـە لای خـەڵك وەك كارێكی زۆر سەرسـوڕهێنەر بێـت. لەسـەر دەزگـا بەڕێوەبەریەتیـەكانیش پێویـستە زۆر ئاگادارو شارەزا بن بە هەموو ئەو ناوەندانـەی هەڵدەسـتن بـە هەڵسوڕانی ئـەو كارانـە، وەك: ئەوانەی نووسەرن، زانـاو فەقیهـەكان، بەڕێوەبـەرەكان، پیـاوانی ڕامیـاری بـەرز،

---

1ـ محمد حسين فضل الله، تأملات إسلامية حول المرأة، ص30.

خاوەن دەسەڵاتەکان، ئەوانەی خۆمان بڕوانامەی زانکۆمان پێبەخشیوون، ئەوانەی خۆمان ئامادەمان کردوون وڕاهێنانمان پێ کردوون لەسەر ئاستێکی بەرز، بۆئەوەی بتوانن خزمەتەکان بگەیەنن کە هەربۆئەوەش ئامادە کراون .[1]

10- کۆمەڵگە یەك پارچە نەبوو، دووبەرەکی وپارچە پارچەیی هۆکارە بۆ هەرەس هێنان بەرامبەر بچوکترین مەترسی وهەڕەشە، بۆیە کۆمەڵگە بە هەموو چینەکانیەوە نەیتوانی فەرمان بەچاکەو بەرگری لە خراپە بکات، تاوەکو کار گەیشتە ئیمڕۆ. هەر نەتەوەکی ناو ئوممەتی ئیسلامی ئەو دوو کارە ئەنجام نەدات ئەوا دەکەوێتە بەر توڕەیی ونەفرەتی خوا دەکەوێ.

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعْتَدُونَ ﴿٧٨﴾ كَانُواْ لَا يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ ﴾المائدة 78 ـ 79.

موحەمەد قوتب دەڵێ: موسڵمانان لە جیاتی ئەوەی بەرنامە بۆ خەڵك داڕێژن ، فەرهەنگ وزانستی ببەخشن بە خەڵك، لەو سەردەمەی ئێستامان دەبینین خۆی ڕادەکات بە هەناسە بڕکێ بەدوای بەرنامەی خەڵکانی بێگانەی کە دژ بە ئاین وخووڕەوشتەکەی خۆیەتی.[2]

11- خاڵێکی گرنگ وکۆتایی: زۆربەی زانایان ئیسلامی ئەو سەردەمە هەڵنەستان بە پێشکەشکردنی ئیسلامێکی ڕاستەقینەی واقیعی گونجاو لەگەڵ ژیانی کۆمەڵگەکانی ئەو سەردەمە. چونکە کۆمەڵگەی ئیسلامی لەهەموو کاتدا پێویستە ئەو سیفەتانەی تیابێ ئەگەر نا لەناو دەچێت، یەکەمیان یەکپارچەیی وبرایەتی وتەبایی، دادگەری ونەبوونی جیاوازی چینایەتی، حوکم کردن بە قورئان وفەرموودەکان، تێشووی ڕێگەی

1 ـ عجاج نويهض، بروتوكولات حكماء الصهيون، 214/2.
2ـ محمد قطب، قضية تحرير المرأة، ص55.

باوەڕ و تەقوا بێ، فەرمان بەچاکەو بەرگری بکات لەخراپە. هەروەك چۆن خوای گەورە باسی کردووە:﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلَوْ آمَنَ أَهْلُ الْكِتَابِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم مِّنْهُمُ الْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ آل عمران 110.

شەهید سەید قوتب لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا دەڵێ: دەستێکی بەسۆزو بەرنامەدار ئەو ئوممەتەی لە تاریکیەوە بۆ ڕۆناکی گواستەوە، هێناویەتیە سەر شانۆی ژیان، ئەو ئوممەتە ڕۆڵی تایبەتی هەیە، شوێن ومەکانەتی تایبەتی خۆی هەیە، لای ئوممەتانی تر حیسابی بۆ دەکرێ. ئەو ڕاستیە ڕاستەقینەنەیەکە پێویستە موسڵمانان بیزانن، کەوا ئەوان هاتوون تاوەکو پێشەنگ بن، سەرکردایەتی مرۆڤایەتی بکەن، چاکترین وباشترین ئوممەتن، خوای گەورەش دەیەوێت باشتر وچاکتر سەرکردایەتی مرۆڤایەتی بکات لەسەر زەوی نەوەك خراپەو شەڕ سەرکردایەتی زەوی بکات، هەربۆیەش نابێ پێشەنگ شت لە خەڵکانی تری نەفام وەربگرێ، بەڵام پێویستە ئەوەی لایەتی لە ڕاستی و دادوەری، بیروباوەڕی دروست، زانیاری وزانستی دروست، خووڕەوشتی دروست بیبەخشێ وپێشکەشی کۆمەڵگەکانی تری بکات، ئەوە ئەرك وفەرمانی ئەوە، هەر ئەو کارەیە بوونی ئەو دەپارێزێ، هەر بۆ ئەوەش دروست کراوە.

ئەرکی ئەوەیە هەردەم سەرکردە بێ، لە پێشەنگی گەلان بێ، بۆ گەیشتن بەو دوو ئاستە کاری زۆری دەوێ، ئەرکی قورسی دەکەوێتە سەرشان، بە ئاسانی نایەتە بەرهەم، بەڵکو دەبێ لە بیروباوەڕو ڕێسای کۆمەڵایەتی شیاوی ئەو کارە گەورە بێت. دەبێ لە بواری زانست وئاوەدان کردنەوەی زەوی دەستی باڵای هەبێ، ڕۆڵی کاریگەر بگێڕێ، تاوەکو سیفەتی جێنشینی خوای لەسەر بێتەجێ.

لێرەوە بۆمان بەدیار دەکەوێت، ئەو بەرنامەی بۆی دانراوە داوای ئەرك وفەرمانی زۆری لێدەکات کە ئەنجامی بدات، هانی دەدات لە هەموو بوارەکانی ژیان پێش

بکەوێ، ئەگەر موسڵمانان ئەو خاڵانەیان جێبەجێ کرد ئەوا ئەوکات دەبنە باشترو چاکترین ئوممەت و پێشەنگی گەلانی جیهان وەردەگرن. لە هەرکات وسەردەمێکدا ئەگەر پشتیان لەو پرۆژەو بەرنامەیە کرد،ئەو باروگوزەرانیان لە ئێستا باشتر نابێت.[1]

1ـ سيد قطب، في ظلال القرآن، 1/ 447.

# بەشی پێنجەم

# ئـــافرەت لە ئیســـلامدا

باسی یەکەم : یەکسانی لە نێوان ئافرەت وپیاو لە مرۆڤایەتی و لە ئەرك وپاداشتدا

باسی دووەم: یەکسانی لە شیاوی

باسی سێیەم: مافی فێربوون وهەندێ مافی تر

**دەروازە:**

لە کتێبی (پیاوان و ژنان تەوکاری نا یەکسان) زۆر بەدرێژی باسی ئەرك وفەرمانی هەردوو ڕەگەزمان کردووە، لەگەڵ جیاوازی نێوانیان، لەسەر ڕۆشنایی کامەیان گونجاوترو شیاوترە، هەروەها ئەو گونجاوی وشیاویە لەسەر ڕۆشنایی جیاوازیە خۆڕسکی وفیتریەکانی جەستەیی ودەرونی بووە. هەروەها ئەوەشمان ڕوون کردەوە کەوا هەردوو ڕەگەز نایەکسانن، لە هەمان کاتدا تەواوکاری یەکترین، بەبێ ئەو هاوکێشەیە هەرگیز ڕەوڕەوەی ژیان بەڕێوە ناچێت. چونکە هەر ئەو هاوکێشەیە وا دەکات ئەو دوو ڕەگەزە ئارەزوویان بۆ یەکتری بچێت، لەئەنجامی ئەو ئارەزووە فیتریە، خۆشەویستی دروست دەبێت ولەئەنجامی بەیەکگەیشتنی ئەو دوو نایەکسانەش نەوەکانی دوا ڕۆژ دروست دەبن. هەر کات هەوڵی بەیەکسان کردن بدرێت لە ڕووی فسیۆلۆژی وبایۆلۆژیەوە(کە هەرگیز ناتوانری) ئەوا کۆمەڵگە تووشی سەرلێشێواوی وگومڕایی ولەناوچوون دەبێتەوە.

ئەگەر تەماشای ئەرکەکانی سەر شانی ئەو دوو ڕەگەزە بکەین بە شێوەیەکی گشتی دەبینین زۆر لەیەکەوە نزیکە، ئەو جیاوازیەی کە هەیە تەنها لە دەروازەی گونجاوی شیاوی یەکێکیانە زیاتر لەوی تر بۆ هەندێ کار، گونجاوی وشیاوی ئەوی تریانە بۆ هەندێ کاری تر، هەروەك بە درێژی باسی هەریەکمان کردووە.

خوای گەورە کاتێ باسی ئەوە دەکات کەوا ئادەمیزاد جێنشینی ئەوە لەسەر زەوی مەبەستی هەردوو ڕەگەزە، چونکە بەبێ ئەو دوو ڕەگەزە مەبەستی جێنشینایەتی نایەتە دی کە ئاوەدانکردنەوەی زەویە بە هۆی نەوەکانی ئادەمیزادەوە. بۆ هەردووکیان بەرنامەی دارشتووە وکارەکان و مافەکانی دیاری کردووە. بەڵام ئەوەی زۆر تێبینی دەکرێت لە قورئان وفەرموودەکان زۆر زیاتر باسی مافی ئافرەتان کراوە، ئەوەش وا هەست دەکەم لەبەر دوو هۆ بێت:

1- لە شارستانیەتەکان وکۆمەڵگەکان وئاینە گۆڕدراوەکان وشەریعەتە دەستکردەکانی تری پێش ئیسلام ئافرەت زۆر ستەم لێکراو بوو، مافەکانی پێشێل

کرابوو، سزاو ئازاری زۆری لەسەر بوو(هەروەك ئاماژەمان بە هەندێکیان کرد)، بۆیە خوای گەورە لە ئاینی ئیسلام ئافرەتی زۆر بەرز نرخاندووەو ئەو شتانەی دەگووتراو دەکران بەرامبەر بە ئافرەتان بە ناڕەوا هەمووی ڕەتکردۆتەوە.

2- خوای گەورە چونکە خۆی ئادەمیزادی خولقاندووە، هەر خۆشی دەزانێ پێکهاتەی جەستەیی ودەروونی بۆ چ کارێك گونجاوەو بەرگەی کام کار دەگرێت ئەوا بۆی دیاری کردووەو کردیتیە ئەرك بەسەریەوە، کام کارەش بۆی گونجاو نیەو بەرگەی ناگرێت، ئەوا لەسەری فەرمان نەکردووە کە بیکات، ئەگەر بیکات ئەوا خۆی و خەڵکانی تر تووشی نەهامەتی ودەردەسەری دەکات. هەروەها خوای گەورە ئاگادارە بەوەی کەوا ئافرەت ناسکترە، کاری فسیۆلۆژی منداڵبوون وشیرپێدان وپەروەردەکردنی لەسەرە کە ماوەکانیان درێژەو ماندوو بوونی جەستەیی ودەروونی زۆری پێوەبەندە، بۆیە زۆر باس لەوە دەکات کەوا ئاگاداریان بن ولەکاتی پیریشدا ڕێزیان بگیرێ، هەروەك لە خوارەوە بە درێژی باسی قۆناغەکانی ژیانی ئافرەت ومافەکانیان دەکەین.

هەر بۆیەش لەسەر کۆمەڵگەی ڕاست ودروست و باوەڕدار پێویستە چاودێریەکی تەواوی ئافرەتان بکەن، هەموو ئەو دەرگایانە واڵا بکەنەوە بۆ فێرکردنیان تاوەکو بگەنە پلەی بەرزی زانست وزانیاری وڕۆشنبیری، ڕێگەشیان بدرێت ئەو زانست وزانیاری وتوانایەی هەیانە پێشکەش بە کۆمەڵگەکەیان بکەن. هەروەها هەموو مافێکی دارایی وکۆمەڵایەتیان پێ بدرێت هەروەك پیاوان، لەگەڵ هەندێ جیاوازی لە وەرگرتنی پۆستەکان، ئەوەش لەبەر گونجاویەت وشیاویە.

ئەو کۆمەڵگەی کە ئەو مافانە پێشێل دەکات، یان دان بەو ڕاستیانە نانێت، ئەوا هەردەم کۆمەڵگەیەکی دوا کەوتووەو بەرەو نەمان دەچێت، جا ئەو کۆمەڵگەیە خۆی بە باوەڕدار دابنێت یان کۆمەڵگەی بێ باوەڕان بێت. هەر کۆمەڵگەیەکیش هاوسەنگی نەکات لە نێوان مافەکان وئازادی بێ سنووری وبێ بەرنامە، ئەوا ئەویش هەر دواڕۆژی دواکەوتوویی ونەمانە، هەروەك ئەو نموونانەی بۆمان هێنانەوە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا ڕوویاندابوو.

لە قورئانی پیرۆز ژمارەیەکی زۆر ئایات هاتووە، هاوکات لەگەڵ ژمارەیەکی زۆریش لە فەرموودە دەربارەی مافەکانی ئافرەت، لەهەموو قۆناغەکانی ژیانی هەر لە تەمەنی کۆرپەلە تاوەکو پیری وپەککەوتەیی، بەمەش ئیسلام ئەوە دەسەلمێنێ کەوا ئافرەت نیوەی کۆمەڵگەیەو خاوەن کەسایەتی وپلەوپایەی خۆیەتی.

ئەگەر ئافرەتیش ئەو فەرمایشتانەی کە خواو پێغەمبەرﷺ بۆی داناوە جێبەجێی بکات، ئەوا سەربەرزی دونیاو دواڕۆژی بۆ خۆی بەدەست هێناوە، لەگەڵ هێنانەدی پارێزگاری خۆیی وخێزانی وکۆمەڵگە ونەتەوەکەی.

# باسی یەکەم

# یەکسانی لە نێوان ئافرەت وپیاو لە مرۆڤایەتی و لە ئەرك و پاداشتدا

**بەندی یەکەم: یەکسانی لە نێوان ئافرەت وپیاو لە مرۆڤایەتیدا**

**بڕگەی یەکەم: واتای زمانی یەکسانی**

**بڕگەی دووەم: یەکسانی لە مرۆڤایەتی**

**بەندی دووەم: یەکسانی لە نێوان ئافرەت وپیاو لە ئەرك وپاداشتدا**

**بڕگەی یەکەم: یەکسانی لە ئەرك وپاداشتدا**

**بڕگەی دووەم: یەکسانی لە سزاکان**

## بەندی یەکەم: یەکسانی لە نێوان ئافرەت وپیاو لە مرۆڤایەتیدا

**بڕگەی یەکەم: واتای زمانی:** تساوت الأمور: یەکسانی لەکار، یەکسان کرا، هاتنە یەك ئاست، تماپلا: هاوتا کرا.[1]

یەکسانی لە زاراوەدا (اصطلاحاً):

تەماشا کردنی هەردوو ڕەگەز بە یەکچاو، چونکە لە سروشتی مرۆڤایەتیدا یەکسانن، هیچ یەکیان لە بنەمای مرۆڤایەتی لەوی تر زیاتر نیە، هیچیان ڕێزو فەزڵی بەسەر ئەوی تریانەوە نیە، تەنها هەندێ فەزل هەیە لە پێکهاتەی یەکیان بەسەر ئەوی تر، ئەویش شتێکی خۆڕسکە لە ژێر کۆنترۆڵی خۆیاندا نیە، واتە بەدەست خۆیانەوە نیە.[2]

### بڕگەی دووەم: یەکسانی لە مرۆڤایەتی

ئافرەت وپیاو لەیەك پلەو ئاستدان لە ڕووی مرۆڤایەتیەوە، خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴾ النساء: 1.

خوای گەورە باس لەوە دەکات کەوا بنەڕەتی هەردوو ڕەگەز نێرینەو مێینە یەك باوك ودایکە، تاوەکو بەزەییان بەیەك بێتەوە، ئاشنایی وهاوکاری یەکتری بکەن. هەر لەو دیك وباوکەوە ژمارەیەکی زۆر لە پیاوو ژنی خولقاندووەو لە سەر زەوی بڵاوی کردوونەتەوە، بە شیوەو زمان وڕەنگی جیاواز.

سەید قوتب دەڵێ: زۆر هەڵەی گەورەو پڕ ئازار کرا دەربارەی ئافرەت، کە ووترا ئەو ڕەگەزە سەرچاوەی پیسی، شەڕو فیتنەیە. بەڵام خوای لە هەمان ئەو نەفسە خولقێنراوە کە پیاوی لێ خولقێنراوە، هەمان پێکهاتەی هەیە، لە دوایدا دەبنە هاوسەری یەکتری، تاوەکو لەو نێوانە نەوەی زۆر بکەوێتەوە لە هەردوو ڕەگەز. کەواتە

---

1 ـ ابن منظور، لسان العرب، 443/6.

2ـ الوافي، علي عبد الواحد، المرأة في القرآن الكريم، ص38.

جیاوازی نیە لە سەرچاوەو فیترە، بەڵكو جیاوازی لە ئامادەباشی وجۆری كاركردن هەیە(الاستعداد و الوظیفة).

مرۆڤایەتی سەردەمانێكی زۆر لە سەرلێشاووی وسەرگەردانی دەژیان وئافرەتیان بێبەشكردبوو لە زۆربەی سیفەتەكانی ئادەمی ومافەكانی لە ژێر كاریگەری ئەو تەصەوڕە بێ نرخ وبێ سەرچاوەیەی كەوا ئافرەتی تاوانبار كردبوو بەوەی ئەو یەكەمجار بەروبوومی ئەو دارەی خوارد كە خوا قەدەغەی كردبوو لە بەهەشت، هەروەها هەر ئەویش هانی ئادەمی دا كە لەو دارە بخوات. بەڵام كاتێ ویستیان ئەو هەڵەیە چارەسەر بكەن، تۆڵە بۆ ئافرەت بكەنەوە گوایە مافی پێدەدەن، كەوتنە ناو هەڵەیەكی تر ئەویش ڕێگەخۆشكردن بوو بۆ ئەوەی ئافرەت بە ئارەزووی خۆی هەرچیەكی بیەوێ بكات، ئەو هەڵانەش بە ماف دابنرێ وڕێگەی پێبدرێ. ئەوانە لەیادیان چووە كەوا ئافرەت وپیاو تەواوكەری یەكترین هەر یەكیان ئامادەباشی خۆڕسكی تیایە بۆ ئەنجامدانی هەندێ كاری تایبەت، كەواتە ئەو دوو ڕەگەزە تەواوكارن بەڵام نایەكسانن.[1]

## بەندی دووەم: یەكسانی لە ئەرك وپاداشت وسزا (التساوي في التكيف والجزاء)

پێشێل كردنی مافی ئافرەتان بەبێ هەڵاوێردان لە هەموو كۆمەڵگەكان هەبوو، لە هەر سەردەمێك ڕەنگ و تایبەتمەندیەكی خۆی هەبوو. بەڵام زۆر بەدەگمەن یەكسانیمان بەدی كرد لە نێوان ئەو دوو ڕەگەزە لە ئەرك وپاداشتدا لە دونیاو دواڕۆژدا.

### بڕگەی یەكەم: یەكسانی لە ئەرك وپاداشتدا

هەروەك لە پێشەوە باسی ئەو هەموو مەینەت وسووكایەتیەمان كرد كە دەربارەی ئافرەتان ئەنجامدەدرا لەلایەن خاوەن دەسەڵات وخاوەن سامان وبەناو پیاوانی ئاینی، بە هۆی دانانی چەند یاساو ڕێسایەكی دەستكرد لە سەر بنەمای هەواو ئارەزووە

1ــ سید قطب، في ظلال القرآن،574/1.

کاتیەکانیان. لەو بارو دۆخە تەنگانەدا ئافرەت تووشی زۆر دەردەسەری وماندوو بوونی جەستەیی ودەروونی بوو، هەروەها ئافرەت لە سەردەمەکانی نەفامی و سەردەمەکانی لادانی خەڵکان لە ئاینی خوا هەردەم ئافرەت بە بێ هێز سەیر دەکرا، هەردەم ببووە تۆرگانێك کە دەبوایە بە چاوی بەزەییەوە تەماشا بکرایە، ئەو بارە نالەبارە بۆ ئافرەتان بەردەوام بوو تاوەکو ڕۆشنایی ئیسلام دەرکەوت ودەستی ئافرەتی گرت وبەرزی کردنەوەو کردیە هاوشان وهاوتای پیاو لە ئەرك وپاداشتی دونیا ودواڕۆژیدا.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴾ النساء: 1.

ئیسلام دەستی ئافرەتی گرت وبەرزی کردەوە بۆ پلەیەکی بەرز کە لە هیچ کۆمەڵگەیەکی پێشەخۆی ودوای خۆی شتی وای بەخۆوە نەدیبووە وە نایبینێ، لە هەموو ڕوویەکەوە کردوویە بە هاوتای پیاوو نیوەی تەواوکاری پیاوان، کە پێشتر زۆر کەمتر لە بەندەیەك سەیر دەکرا.

لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:(( إنما النساء شقائق الرجال)).[1] هەر بۆ زیاتر زانیاری بەڕێزتان لە قورئانی پیرۆز ووشەی ئافرەت و پیاو، هەریەکیان 24 جار هاتووە.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ وەسیەتی کردووە بە موسڵمانان کەوا لەگەڵ ئافرەتاندا زۆر چاك وباش بن، هەروەك لە ئەبو هورەیرەوە ﵁ بۆمان گەڕاوەتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((من كان يؤمن بالله واليوم الآخر فلا يؤذي جاره، واستوصوا بالنساء خيراً، فإنهنّ خلقن من ضلع، وإن أعوج شيء في الضلع أعلاه، فإنْ ذهبت تقيمه كسرته، وإنْ تركته لم يزل أعوج، فاستوصوا بالنساء خيراً)).[2]

---

1ـ السيوطي، جلال الدين، الجامع الصغير الحديث: 2560، 344/1.

2- البخاري: 80- النكاح باب:1 حديث:4890 1987/5.واتای ئەو فەرموودەیە بە درێژی و بەشێوەیەکی زانستی پزیشکی ڕوونکراوەتەوە لە کتێبی ( پیاوان وژنان تەواوکاری نا یەکسان/ بەرگی دووەم- دانەر).

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ کەوا ئافرەت ئادەمیزادێکی ژیرەو خاوەن هەڵوێست وبیرو هۆشی خۆیەتی، بە گوێرەی توانای جەستەیی خۆی کە خوا پێی بەخشیووە لە کاروباری ناو کۆمەڵگە بەشداری دەکات، بە پشت بەستان بەو باروذۆخ وکاتەی ئەو کۆمەڵگەیە تیایدا دەژیت، لەگەڵ ڕەچاوکردنی باری خێزانداری وئەو مەرجانەی کە ئاین بۆی داناوە.

خوای گەورە پاش ئەوەی یەکسانی ئەرك وفەرمانی دا بەسەر هەردوو ڕەگەز، بڕیاریشیدا کەوا گەورەیی وبەرزی لای خوا بە ڕەگەزو نەتەوەو ڕەنگ وڕوخسار نیە، بەڵکو بەرزی وگەورەیی بە بەندایەتی بۆ خواو پەرستن وتەقوایە. کەواتە تەنها پەرستنی خوا نرخی ئادەمیزاد نیشان دەکات، هەر ئەوەیە نرخی چەسپاو نەوەك سامان وپلەوپایەو نەتەوە، چونکە ئەوانە نرخی گۆڕاون.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾الحجرات: 13.

هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی:﴿وَمَا خَلَقَ الذَّكَرَ وَالْأُنثَىٰ ﴿٣﴾ إِنَّ سَعْيَكُمْ لَشَتَّىٰ﴾ الليل: 3،4.

لە کۆکردنەوەی پێکەوە بەستانی هەردوو ڕەگەز لەو ئایەتەدا ئەو واتایە دەگەیەنێ کەوا خوای گەورە بەیەکچاو تەماشای هەردووکیان دەکات، ئەرك وفەرمان لەسەر هەردووکیانە وهەردووکیشیان پاداشی کارو کردەوەکانیان وەردەگرن. هەروەها ئەو ئایەتە ئامارەش بەوە دەکات کەوا هەریەکیان کاریان جیاوازە لەوی تریان، واتە هەریەك بۆ کارێك گونجاوە.

هەروەها لە پاداشت یەکسانن، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ : ﴿فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لَا أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ ۖ بَعْضُكُم مِّن بَعْضٍ ۖ فَالَّذِينَ هَاجَرُوا وَأُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَأُوذُوا فِي سَبِيلِي وَقَاتَلُوا وَقُتِلُوا لَأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَلَأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ثَوَابًا مِّنْ عِندِ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ عِندَهُ حُسْنُ الثَّوَابِ﴾ آل عمران:195.

لێرەوە بۆمان دیار دەکەوێت کەوا چۆن لە مرۆڤایەتی یەکسانن، بە هەمان شێوە لە ئەرك وپاداشتیش یەکسانن.

ئیبن کثیر دەڵێ: خوای گەورە وەڵامیان دەداتەوە، هەردوو ڕەگەز، بێ جیاوازی، هەموو یەکسانن لە ئەرك وپاداشت، هەریەکیان بە گوێرەی کردەوەکانیان پاداشتیان هەیە.[1]

سەرجەمی زانایان لەگەڵ ئەوەن کەوا هەر ئایەتێك لە قورئان هاتبێ ئاماژە بۆ موسڵمانان یان ئیمانداران بکات لەسەر شێوەی تاکی نێرینە، یان کۆی نێرینە، کە پەیوەندی هەبێ بە بابەتەکانی ئەرك وپاداشت، کاروکردەوە، هەروەها مافەکان، ئەوا هەردوو ڕەگەز دەگرێتەوە، مەگەر ئایەتێك یان نەصێکی تر ئەو بابەتە تایبەتمەندتر بکات، وەك: هەندێ کاتی خواپەرستی، ئەرکی دارایی. هەروەها بەهەمان شێوە دەربارەی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ.[2]

## بڕگەی دووەم: یەکسانی لە سزاکان

### یەکەم: سزای دزی کردن

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓا۟ أَيْدِيَهُمَا جَزَآءًۢ بِمَا كَسَبَا نَكَـٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ المائدة: 38. واتە هەردوو ڕەگەز یەکسانن لە سزای دزی کردن.

### دووەم: سزای داوێن پیسی – زینا

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِى فَٱجْلِدُوا۟ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِا۟ئَةَ جَلْدَةٍ﴾ النور:3. هەریەکیان پاداشتی لێدانی 80 دارە.

---

1ـ ابن كثير، تفسير القرآن العظيم، 843/2.

2ـ دروزة، المرأة في القرآن والسنة ، ص29.

**سێیەم: سزای ڕێگەگری وخەڵك ترساندن وكوشتن**

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسْعَوْنَ فِى ٱلْأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوْ يُصَلَّبُوٓاْ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلَٰفٍ أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ ٱلْأَرْضِ ۚ ذَٰلِكَ لَهُمْ خِزْىٌ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ المائدة: 33.

**چوارەم: تۆمەت هەڵبەستان**

سزای توند بۆ ئەوانەی تۆمەت بۆ ئافرەتانی داوێن پاك هەڵدەبەستن.

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُواْ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَٰنِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُواْ لَهُمْ شَهَٰدَةً أَبَدًا ۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴾ النور :4. خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ٱلْغَٰفِلَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ لُعِنُواْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾ النور :23

هەروەها یەكسانن لە سنوورەكانی تر، وەك: مەی خواردنەوە، نێربازی ومێ بازی و زۆری تر.

گووتنی هەق وڕاستی دەربارەی مافی ئافرەت هەروەك گووتنی هەق و ڕاستیە بەرامبەر بەهەموو كێشەكانی تری مرۆڤایەتی، هەوڵدان بۆ سەركەوتنی مافی ڕاستەقینەی ئافرەتان، هەوڵدانە بۆ سەركەوتنی ئاینی خوا، چونكە مافی ئافرەتان مافی دایك ودایپرو خوشك وپورو كچی خۆمانە، ئافرەت تەواوكاری پیاوە ونیوەی كۆمەڵە، كەواتە سەركەوتنی ئافرەت سەركەوتنی خودی پیاوو كۆمەڵگەیە، چونكە ئافرەت نزیكترین كەسە لە پیاو، هەروەها سەركەوتنی دایكی نەوەكانی دواڕۆژە و سەركەوتنی كارگەی كەڵە پیاوانی نەتەوەو شارستانیەت ومرۆڤایەتیە. بەرامبەر ئەوەش هەر سوكایەتیەك بەرامبەر بە ئافرەت، سوكایەتی یە بە دایك وخوشك وپورو كەس وكاری خۆمان، وە سوكایەتی یە بەخودی پیاو، چونكە ئافرەت نیوەی كۆمەڵە و هاوسەری پیاوە.

## باسی دووەم

# یەکسانی لە شیاوی

بەندی یەکەم: واتای شیاوی وگونجاوی

برگەی یەکەم: واتای شیاوی لە زمانەوە

برگەی دووەم: واتای شیاوی لە زاراوەوە

بەندی دووەم: شیاوی ئاینی وئابوری

برگەی یەکەم: شیاوی ئاینی

برگەی دووەم: شیاوی ئابوری

بەندی سێیەم: شیاوی کۆمەڵایەتی وخێزانداری

برگەی یەکەم: شیاوی کۆمەڵایەتی

برگەی دووەم: شیاوی خێزانداری

## بەندی یەکەم: واتای شیاوی وشیاوی ئاینی وئابوری

### بڕگەی یەکەم: شیاوی لە زمانەوە( الاهلية في اللغة )

(أهلَ: يستأهِل الاستِئهال من الإهالَةِ، تستأهِل ، وتقول أهـل لهـذا الأمـر. واتـە: گونجاوی، هەق ومافی خۆیەتی ئەو شتەی پێبدرێت، دەڵێن: ئەو شیاوە بەو کارە. الأهلية: الصلاحية، أي صالح لـە. دەڵێن: فلانە کەس شیاوە بۆ ئەوەی چاودێری وسەرپەرشتی ئەو کارە بکات، واتە بۆی گونجاوە وچاکسازی تیا دەکات.[1]

### بڕگەی دووەم: شیاوی لە زاراوەوە

دەکرێت بە دوو بەش:

أ- شیاوی پێویست و واجیب (أهلية الوجوب): گونجاوی وشیاوی ئادەمیزادە بۆ ئەو مافە شەعیانەی هەیەتی وئەوانەی لەسەریەتی.[2]

ب- شیاوی گونجاوی بۆ هێنانەدی وئەداکردن (أهلية الأداء): بریتیە لە شیاوی وگونجاوی ئادەمیزاد بۆ هێنانەدی ئەو کارانەی لەتوانای دایە کە لە ڕووی شەرعیەوە حیسابی بۆ دەکرێ.[3] یان: ئەو سەلاحیەتەیە کە بۆ ئادەمیزادان دانراوە، ئەگەر قسەیەکی گووت یان کردارێکی کرد، ئەوا لە شەرع حیسابی بۆ بکرێت وحوکمەکانی لەسەر بچەسپێ.[4]

هەروەك گووتمان خوای گەورە بەشێوەیەکی گشتی یەکسانی داناوە لە ئەرك وفەرمان وماف لە نێوان ئەو دوو ڕەگەزەدا، مەگەر خۆیان بە خۆڕسك جیاوازیان تیادا بەدی بکرێت، یان گیانی داد وڕاستی وا بخوازێ کە جیاواز بن. هەر بۆیەش ئیسلام بەیەك چاو تەماشایان دەکات، نایەوێت ئافرەت لە کەسایەتی پیاودا بتوێتەوە، لە

1ـ ابن منظور، لسان العرب، 254/1.
2ـ عبد الكريم زيدان، الوجيز في علم الأصول، ص92.
3ـ كامل موسى، فقه المعاملات ، ص64.
4ـ خلاف، علم أصول الفقة، ص 135. وعبدالكريم زيدان : الوجيز في أصول الفقه، ص93.

پێش شووکردنی ودوای شووکردنی، هەروەك لەو وولاتانەی خۆیان بە سەروەری مافی ئافرەتان دەزانن، دەبینین هەر دوای شووکردن کەسایەتی، نازناو، ناوی بنەماڵەو هۆزەکەی هەموو دەسڕدرێتەوە دەچێتە سەر ناوی بنەماڵەی مێردەکەی.

## بەندی دووەم: شیاوی ئاینی وئابوری (الأهلیة الدینیة والاقتصادیة)

### برگەی یەکەم: شیاوی ئاینی

ئافرەت وەك پیاوان شیاوو گونجاوە کەوا هەموو بنەماکانی باوەڕ وەربگرێ، لەگەڵ ئامادەبوون بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکانی سەرشانی، جا چ ئەو ئەرکانەی پەیوەستن بە کاری جەستەیی، وەك: نوێژ وڕۆژوو، یان پەیوەستن بە سامان ودارایی، وەك: زەکات، یان پەیوەستن بە هەردووکیانەوە، وەك: حەج. لەو شتانەی باسمان کردن هەردوو ڕەگەز تیایاندا یەکسانن لە ئەنجامدانیاندا، تەنها هەندێ جیاوازی هەیە لە چۆنیەتی ئەنجامدانی ئەو ئەرکانە، کە زۆربەی ئاسانکاریە بۆ ئافرەتان تاوەکو گونجاو بێت لەگەڵ پێکهاتەی جەستەیی ودەرونی، ئەوانەشمان زۆر بەدرێژی بۆ خوێنەری بەڕێز ڕوون کردۆتەوە لە پەراوی (پیاوان وژنان تەوکاری نا یەکسان) بەبەڵگەی زانستی.

سەرەتا تێبینی ئەوە بکەن کەوا ئافرەت وەك پیاو سەربەستی وکەسایەتی خۆی هەیە لە کاتی باوەڕ هێنان بەخواو بنەماکانی تری ئیسلام، بەبێ ئەوەی لە ڕێگەی باوکی یان برای یان هاوسەری بێ، هەروەك خوای گەورەدەفەرمووێ: ﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ﴾البقرة: 285.

لێرەدا سەرنج بدەن کەوا ووشەی باوەڕهێنان(كُلٌّ آمَنَ) بەتاك هاتووە، واتە هەموو تاکێك لە کۆمەڵگە خۆی بەرپرسی باوەڕی خۆیەتی لە هەردوو ڕەگەز، هیچ پەیوەندی بە باوك وبراو هاوسەر وخزمایەتیەوە نیە، کەس وەصی کەس نیە هەرچەندە زۆریش لێی نزیك بێت.[1]

---

1 ــ ابن كثير، تفسير القرآن العظيم، 306/1. والطبري، جامع البيان، 205/3.

هەروەها حوكمەكانی شەرعی كە خوای گەورە ناردوویتیە خوارەوە هەردوو ڕەگەز وەری دەگرن بەبێ پێویست بوونی هیچ كەسێك لەو نێوانەدا، هەروەها لەسەر هەردوو ڕەگەز جێبەجێ دەكرێت.[1]

لە كاتی واژوو كردنی پەیمانی حودەیبیە، لەیەكێك لە بەندەكان نوسرابوو، هەر یەكێك لە بێ باوەڕان هاتە ناو موسڵمانان، پێویستە وەری نەگرن وبۆیان بگەڕێننەوە، بە شێوەیەكی ڕاستەوخۆ باسی ئافرەتان نەكرابوو: ( علی ألّا یأتیك منا أحد وان كان علی دینك إلا رددته إلینا ).[2] لە دواییدا هەندێ لە ئافرەتانی بێ باوەڕ موسڵمان بوون ولە مەككەوە كۆچیان كرد بۆ مەدینە، كافرەكان داوایان لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد كە بۆیان بگەڕێننەوە، ئەوەبوو پێش ئەوەی بۆیان بگەڕێننەوە، خوای گەورە ئەو ئایەتانەی ناردە خوارەوە، كەوا ئەو بەندە ئافرەتان ناگرێتەوە، بۆیە بۆتان نیە ئەو ئافرەتانە بگەڕێننەوە بۆ لای بێ باوەڕان، خوای گەورە فەرموویەتی:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٍ فَٱمْتَحِنُوهُنَّ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَٰتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلْكُفَّارِ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ ﴾ الممتحنة : 12.

كەواتە خوای گەورە بۆ ئافرەتان پەیمانی سەربەخۆی بۆ دانان، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئافرەت شیاوە وگونجاوە بۆ ئەو جۆرە ڕێزگرتنە لەلایەن خواوە. دكتۆر ئەحمەد كوبەیسی دەڵێ: لەسەر ئەو بنەمایە، خوای گەورە ڕێگەی نەداوە بە پیاوی موسڵمان ئەگەر هاوسەرەكەی لەسەر ئاینێكی تر بوو بەزۆر بیكاتە موسڵمان.[3]

---

1ـ الكبيسي، أحمد، فلسفة نظام الأسرة في الإسلام ، ص 100.
2ـ ابن كثير، تفسير القرآن العظيم، 289/4. والقرطبي، الجامع لأحكام القرآن، 18/ 61. والمباركفوري، صفي الرحمن، الرحيق المختوم، ص344.
3ـ الكبيسي، أحمد، فلسفة نظام الأسرة في الإسلام ، ص 100.

## بڕگەی دووەم: شیاوی ئابوری

پاش هەڵاتنی خۆری ئیسلام، خوای گەورە ئافرەتی دەرباز کرد لەو کۆت وزنجیرەی کە پێوەی بەند کرا بوو، خاوەن سامان نەبوو، لە میرات بێبەش بوو، بەئاسانی لای یەکێکەوە دەگوازراوە بۆ لای یەکێکی تر وەك کاڵایەك، هەروەها بۆی نەبوو بازرگانی بکات.

ئاینی ئیسلام ڕێگەیەکی ناوەندی گرتەبەر دەربارەی ئافرەت وئابووری. ئیسلام نایەوێت ئافرەت هەردەم بەکاروکاسبی وبازرگانیەوە خەریك بێت- کە زۆربەی نەگونجاوە لەگەڵ پێکهاتەی ئەو- تاوەکو تووشی ماندووبوون وشەکەتی دەرونی نەبێت وئەرکی ماڵ ومنداڵەکەشی بێتە سەر کاتی گەڕانەوەی، هەروەها منداڵەکانی بداتە دەست خەڵکانێك لە نازانێ چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵیان دەکات، لەلایەکی ترەوە ئیسلام بەوەش ڕازی نیە ئافرەت هیچ سامانی نەبێ، یان سەربەخۆیی بڕیاری ئابوری نەبێ هەروەك بینیمان لە وولاتانی ئەوروپی تاوەکو ناوەڕاستی سەدەی بیستەم بەم شێوەیە بوو.

### یەکەم: میرات

ئافرەت بەشە میراتی خۆی هەیە وەك پیاو، زۆر جار وەك یەك وەردەگرن، هەندێ جار کەمتر، یان نیوە، هەندێ جاریش ئەو وەردەگرێ ونێرینە وەرناگرێ. بۆ ڕەواندنەوەی ئەو تەم ومژەی کرابوو ودەکرێ دەربارەی ئەوەی کەوا ئافرەت هەردەم بە کەمتر دانراوە لە ئیسلام بۆیە نیوەی میرات وەردەگرێ، بگەڕێوە کتێبی دانەر (پیاوان وژنان تەوکاری نا یەکسان) ئەو بابەتە ڕوون کراوەتەوە. لە بارەی میراتەوە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوْلَـٰدِكُمْ ۖ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۚ﴾ ﴿النساء: 11﴾، ﴿وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَٰجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ ٱلرُّبُعُ﴾النساء:12، ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِى ٱلْكَلَـٰلَةِ ۚ إِنِ ٱمْرُؤٌا۟ هَلَكَ لَيْسَ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَهُۥٓ﴾النساء:176.

ئەو سێ ئایەتە هەموو بنەماکانی میراتی تیا ڕوون کراوەتەوە، بەڵام بۆ لقەکانی میرات وچۆنیەتی دابەش کردنی، ئەوا فەرموودەکانی پێغەمبەر وڕای هاوەڵەکان، هەوڵی زانایان وفەقیهەکان هەمووی جیاکردۆتەوەو تیایاندا ڕوون کراوەتەوە. بە هەموو دڵ وقەناعەتەوە دەڵێم هیچ شەریعەتێکی کۆن وهیچ دەستوورێکی نوێی دەستکرد وەك شەریعەتی ئیسلام مافی ئافرەتی نەداوە، بەتایبەتی لە بواری دارایی وئابووری، لەو کاتەی کە کچە، خوشکە، دایکە، داپیرە، بێ کەسە، ئەوەش بە گوێرەی دوورو نزیکی ئافرەتەکە لە مردووەکە.

**دووەم: مارەیی (المهر)**

خوای گەورە دایناوە بۆ پیاوان کەوا مارەیی ئافرەتان بدەن بە دڵ وقەناعەتەوە، ﴿وَءَاتُوا۟ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَـٰتِهِنَّ نِحْلَةً﴾ النساء: 4، وەك مافێكی تایبەتی، ئەو بڕەش دیاری نەکراوە، دەوەستێ لەسەر داب ونەریت، توانای دارایی پیاوەکە، بەڵام ئافرەت گەر بیەوێت دەتوانێ بەڕەزامەندی خۆی بڕێك لەو مارەییەی بدات بە پیاوەکە،﴿ وَءَاتُوا۟ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَـٰتِهِنَّ نِحْلَةً ۚ فَإِن طِبْنَ لَكُمْ عَن شَىْءٍ مِّنْهُ نَفْسًا فَكُلُوهُ هَنِيٓـًٔا مَّرِيٓـًٔا﴾ النساء: 4. ئەگینا بۆ هاوسەرو باوك وبراو کەسی تر نیە لەو پارەیە هیچ بگێڕێتەوە هەرچەندە ئەگەر مارەییەکەی زۆریش بێت، وەك یەك قینتار زێڕ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَءَاتَيْتُمْ إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا فَلَا تَأْخُذُوا۟ مِنْهُ شَيْـًٔا ۚ أَتَأْخُذُونَهُۥ بُهْتَـٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا﴾ النساء:20.

ئەو مافانەی باسمان کردن بەراوورد بکەن لەگەڵ مافەکانی ئافرەت دەربارەی مارەیی لە سەردەمی نەفامی عەرەب، لە ئاینی جولەکەو دەستوورەکانی تر. لە زۆربەی ئەو سەردەمانە ژن خوازی وەك گرێبەستەکی بازرگانی بوو لە نێوان باوکی کوڕەو کچە، کچە هیچ مافێکی نەبوو لەو سامانەی وەردەگیرا. لە هەندێ کۆمەڵگە لە کاتی ژن بەژنی هیچ مارەییەك بۆ ئافرەت دانەدەنرا.

خاڵێکی تر ئەوەیە کەوا ئافرەت هیچ لە سامانی خۆی خەرج ناکات کاتی شووکردن،

هەمووی لەسەر پیاوەکەیە، بەپێچەوانەی هەندێ لەو کۆمەڵگانەی کە خۆیان بە ماف پەروەرو بەرگریکەر دادەنێن بۆ چەسپاندنی مافی ئافرەتان، بەڵام زۆربەی خەرجی لەسەر ئافرەتە.

**سێیەم: ئافرەت مافی مولکیەت ووەرگرتن وخەرجی پارەی هەیە**

(حقوق الملكية والقبض والصرف)

ئافرەت وەکو پیاو هەموو مافی مولکایەتی وخەرجی ووەرگرتنی سامانی هەیە لە شەریعەتی ئیسلامی، بۆ سامانە گوازراوەکان ونەگوازراوەکان، بازرگانی وهەموو کارێکی تری حەڵاڵ، هەروەها بۆی هەیە حەوالەو کەفالەو وەکالە هیبەو وەصیەت و زۆر شتی تر کە لە کتێبەکانی فیقهی ئیسلامی بە درێژی باس کراون.

**چوارەم: بژێوی دوای شووکردن (النفقة بعد الزواج)**

بژێوی ئافرەت پێش شووکردن لەسەر باوکە، لەدوای مردنی باوك بژێوی لەسەر براکانیەتی، کاتی نەبوونی برا لەسەر نزیکترین کەس وکاریەتی، یان لەسەر خانەی دارایی موسڵمانانە (بیت المال)، دوای شووکردنی ئافرەت، خوای گەورە بژێوی ئافرەتی داناوە لەسەر هاوسەرەکەی هەرچەندە ئەو ئافرەتە دەوڵەمەندیش بێت.[1]

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٍ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡۚ﴾النساء: 34. واتە بژێوی ئافرەت پێویستە لەسەر پیاو، هەرچەندە ئەگەر پیاوەکە هەژاریش بێت وئافرەتەکەش دەوڵەمەند بێت.[2]

ئەگەر پیاو ئەو بژێویەی دابین نەکرد، ئەوا بۆ ئافرەت هەیە لای قازی شکات بکات، ئەگەر هەر نەیتوانی ئەو بژێویە دابین بکات ئەوا ئافرەتەکە دەتوانێ داوای تەڵاق بکات. ئەگەر ئافرەت تەڵاقدرا ئەوا لەماوەی عیدەش بژێوی لەسەر پیاوەکەیە، واتە پێویستە شوێن وخواردن وخزمەتکاری بۆ دابین بکات.[3]

---

1ـ الجزائري، فصل الخطاب في المرأة والحجاب، ص25.

2ـ ابن قيم الجوزية، زاد المعاد في هدي خير العباد، 216/5.

3ـ الحموي، أدب القاضي، ص680 وص985. والخصاف، أدب القاضي، ص644.والبار، محمد علي، أعمال المرأة في الميزان، ص55.

## بەندی سێیەم: شیاوی کۆمەلایەتی وخێزانداری (الأهلیة الاجتماعیة والأسریة)

### برگەی یەکەم: شیاوی کۆمەلایەتی

#### یەکەم: پالپشتی کردن

چونکە ئافرەت لە ژیانی کۆمەلایەتی وئەرکی ئاینی هاوتاو هاوشانی پیاوە، واتە دەبێت ئافرەت پارچەیەك بێت لە کۆمەلگە، بۆ هاوکاری کردنی پیاو، تاوەکو پێکەوە وەك پەنجەکانی دەست پشتی یەکتری بگرن ویەکتری توندوتۆڵ بکەن. بۆیە پێویستە ئەو دوو ڕەگەزە ئاراستە بکرێن بۆ کارە گونجاوەکان، تاوەکو کۆمەلگە باشترین و زۆرترین سوودیان لێ ببینن. هەروەك خوای گەورە بە جوانترین شێوەو برگەی کورتی ڕەوانبێژی باسی ئەو هاوکاری وتەواوکاریەی نێوان ئەو دوو ڕەگەزەی کردووەو دەفەرمووێ: ﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ ٱللَّهُ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ التوبة: 71.

موستەفا سوباعی دەربارەی ئەو ئایەتە دەلێ: بۆ یەکەم جار لە مێژووی مرۆڤایەتی ئافرەت بەو شێوەیە ڕێزی لێ بگیرێ، وەك ئادەمیزادێکی تەواو شیاوو گونجاو هەلسوکەوتی لەگەلێ بکرێت، لەناو کۆمەلگە وەك دایك وکارگەی دروست کردنی پالەوانانی دوا ڕۆژ سەیر دەکرێت، ناودەنگی پارێزراوە، کەس ناتوانێت لەکەداری بکات، بۆی هەیە بەشداری بکات لە کۆڕی زانست وزانیاری وفێربوون، بەشداری دەکات لە کاری بەرگری وڕزگاری کردن، بەگوێرەی توانای خۆی.[1]

#### دووەم: بەشداری کۆڕی خوێندن وفێربوون

لە سەدەکانی خەلافەتی ئیسلامی ئافرەتان بەشداری کۆڕی زانستیان دەکرد،

---

1 ـ السباعي، مصطفى، المرأة بين الفقه والقانون، ص46.

ئافرەتی ناوداری زۆر هەڵکەوتن لەو سەردەمانە، وەك عائیشە، [1] هەروەها نووسەر ووتار بێژو مامۆستای ئافرەت وپیاوان خاتوو( سكينة بنت الحسين ابن علي أبي طالب) [2] لەگەڵ زاناو شاعیرەکان دادەنیشت، بەڵام یەکتریان نەدەدیت. لە زۆر بوار پرسیان پێدەکرد. [3]

**سێیەم: پەنادان**

پێغەمبەری خوا ﷺ هەروەك چۆن ڕێگەیدا کەوا پیاوان پەنای بێ باوەڕان بدەن، بە هەمان شێوە ڕێگەی بە ئافرەتاندا، هەروەك چۆن ئوم هانی پەنای یەکێك لە خزمەکانیدا لە دوای فەتحی مەککە. ((قد أجرنا من أجرت يا أم هانيء )).[4]

**چوارەم: بەشداری لە شەڕ**

ئافرەت دەتوانێ لە جەنگ وشەڕ بەشداری بکات بۆ هاوکاری جەنگاوەران لە کاری برین پێچی وئاوهێنان وهاندان وهێنانی چەك وکەلوپەل. هەروەك بینیمان لە بەشداری ئافرەتانی پێغەمبەرو موسڵمانان لە زۆربەی جەنگەکان. بەدرێژی باسی ئەو بابەتەمان کردووە لە کتێبی (پیاوان و ژنان تەوکاری نا یەکسان).

## بڕگەی دووەم: شیاوی خێزانداری (الأهلية الأسرية)

لە چەند خاڵێك ئەو بابەتە ڕوون دەکەینەوە

یەکەم: مافی هەڵبژاردنی هاوسەر (حق اختيار الزوج)

---

1ـ بە درێژی باسی عائیشە ؓ کراوە لە بابەتی ئافرەت وخوێندن وفێربوون

2ـ سكينة بنت الحسين ابن علي أبي طالب ؓ: ناوی ئامینەیە، لەکاری نووسین وئەدەب وهونەر وفیقهی ئیسلامی ڕۆڵی کاریگەری هەبوو، شووی کرد بە عبد الله ی کوڕی حەسەنی کوڕی ئیمامی عەلی، پێش گواستنەوەی لە تایف کوژراوە، دوایی موصعەبی کوڕی زوبێر مارەی کردووە، لە مەدینە کۆچی دوایی کردووە ساڵی 117ك. الزركلي، الأعلام ،161/3. وكحالة، أعلام النساء، 202/2-224.

3ـ بنت الشاطيء، عائشة عبد الرحمن، سيدات بيت النبوة، بيروت، دار الكتاب العربي، ط2، 1978م، ص1024.

4ـ البخاري: 6- كتاب:الجهاد والسير باب: أمان النساء وجوارهن، الرقم:3171، 328/6.

هەرچەندە جیاوازی هەیە لە نێوان زانایان دەربارەی وەلی ئافرەت، بەڵام ئەوەی جێگەی پەسەندی هەموانە ئەوەیە پێویستە ڕای کچەکە وەربگیرێ ورەزامەندی وەربگیرێ پێش مارەبڕینی، نابێت کەسیش دەست بخاتە کاری ئەو شوو کردنە، تەنها گەر بۆ بەرژەوەندی ئەو نەبێ، وەك: ئامۆژگاری بۆ شتی بەسوودترو بەرژەوەندی زیاتر، دوور لە پاڵەپەستۆ خستنە سەر، یان بە زۆر بە شوودانی بەیەکێکی دیاری کراو بۆ بەرژەوەندیەکی کاتی وەك پارەوپول و نزیك بوونەوە لە بنەماڵەیەکی تایبەت. ئەو ئازادی هەڵبژاردنە هەردوو ڕەگەز دەگرێتەوە بەبێ جیاوازی.

لە ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕنەوە، کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئافرەتی بێوەژن شوو دەکات بە فەرمان ورەزامەندی خۆی، کچیش شوودەکات دوای وەرگرتنی ڕەزامەندی. ئەگەر قسەشی نەکرد لە شەرمان ئەوا جێگەی ڕەزامەندی دەگرێتەوە))

.((لا تنكحُ الأيم حتى تُستأمر ولا تنكح البكر حتى تستأذن))، قالوا: يا رسول الله، وكيف إذنها؟ قال: ((أن تسكت)). [1]

هاوسەرێتی، واتە ژیانی بەردەوام، هاوبەشی وهاوکاری، کەواتە خۆشەویستی دروست نابێت ئەگەر ڕەزامەندی هەردوولا نەبێت. خوای گەورەش بۆ بەردەوامی ژیانی هاوسەرێتی خۆشەویستی وبەزەیی وسۆزی خولقاندووە. هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ مارەیی خەنسای ئەنساری ﷺ ڕەتکردەوە کاتێ بە شوودرا بەڵام ڕەزامەندی لەسەر نەبوو. ئەوە فەرمانەکانی ئایینی ئیسلامە، هەر شتێکیش لە دوای ئەوەوە ئەنجام بدرێ بەناوی ئیسلام ئەوا هەڵبەستراوە، یان نا تێگەیشتنە بە حوکمەکانی فیقهی ئیسلام. [2] : ((أن أباها زوّجها وهي ثيبٌ فكرهت ذلك، فأتت رسول الله ﷺ فردَّ نكاحه)). [3]

---

1ــ البخاري 70-النكاح باب: 42 حديث: 4843 ، 1974/5.
مسلم : 16- النكاح باب:9حديث :64-1419 ، 3 /1442.
أبي داود كتاب: النكاح باب: الثيبحديث : 2089 ،232/2 .
2ــ خنساء بنت خدلم الأنصارية: لە بنەماڵەی عەمرۆ کوڕی عەوفە، لە پێغەمبەری خوا هەڵمت فەرموودەی گێڕاوەتەوە. الإصابة ، 286/4، الرقم : 353.
3 ــ البخاري:70- لنكاح باب: 43 حديث: 4845 ، 5/ 1974.

خوای گەورە فەرموویەتی: ئافرەتی باش وچاك وپاك هەڵبـژێرن، لەبـەر پـیرۆزی ژن هێنان خوای گەورە دەوڵەمەندتان دەكات. ﴿وَأَنكِحُوا الْأَيَامَىٰ مِنكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ ۚ إِن يَكُونُوا فُقَرَاءَ يُغْنِهِمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ ۗ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾النور: 32.

دووەم: ئافرەت مافێكی زۆری هەیە لە داواكردنی تەڵاق ودابڕان وهەڵوەشانەو (الخلع والفسخ والتفريق)، هەروەها دەتوانێ دادوەرێك بهێنێ لە بنەماڵەی خۆی بۆ بەرگری كردن وماف وەرگرتنی. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَا إِن يُرِيدَا إِصْلَاحًا يُوَفِّقِ اللَّهُ بَيْنَهُمَا ۗ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا ﴾ النساء:35. ئەو دوو دادوەرە هەوڵدەدەن كە ئەو دوو هاوسەرە بگەینەوە یەكتری وشیرازەی ئەو خێزانە نەپچڕێ، هەروەها ئافرەت دەتوانێ دابەزێ لە هەندێ لە مافەكانی بۆ هاوسەرەكەی، كە باشترە لە دەست لێك بەردان وتەڵاق، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِن بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا ۚ وَالصُّلْحُ خَيْرٌ ...﴾النساء: 128.

**دووەم: مامەڵەی چاك**

خوای گەورە لەسەر پیاوی داناوە كەوا مامەڵەی چاك بكات لەگەڵ ئافرەتەكەی هەرچەندە ئەگەر دڵی بۆ نەچێت وقینی لێی بێت. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ ۚ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰ أَن تَكْرَهُوا شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا ﴾ النساء: 19.

هەروەها لە ئەبو هورەیرەﷺ دەگێڕنەوە كەوا پێغەمبەر خوا ﷺ فەرموویەتی:(( تەواوترین باوەڕدار ئەویە كە جوانترین خووڕەوشتی هەبێ، چاكترین وباشترینتان ئەو كەسەیە كە لەگەڵ هاوسەرەكەی باش وچاك بێت)). ((أكمل المؤمنين إيماناً أحسنهم خلقاً، وخيركم خيركم لأهله)).[1]

---

1ـ الطبراني، المعجم الأوسط، الرقم: 4420 ، 356/4.

**سێیەم: پاش تەڵاقدران و وەفات کردنی هاوسەر**

پاش ئەوەی ئافرەت تەلاقدرا یان هاوسەرەکەی وەفاتی کرد، ئەوا بۆی هەیە شوو بکاتەوە، بەبێ ئەوەی فەرمان ودەسەلاتی کەسی بەسەرەوە بێ. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ فِي أَنفُسِهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ البقرة:234.

خوای گەورە فەرموویەتی:﴿ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَن يَتَرَاجَعَا إِن ظَنَّا أَن يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ البقرة:230.

ئافرەت دەتوانێ خۆی داوای تەلاق بکات بەرەزامەندی هەردوولا، یان لە دادگا داوا بکات.[1] خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ وَلَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا إِلَّا أَن يَخَافَا أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ البقرة :229.

هەروەها مافی هەیە داوای تەلاق بکات بۆ لادانی زیان لەسەر خۆی، وەك: بابەتی ئیلا (پیاو سوێند بخوات کە نەچێتە لای هاوسەرەکەی)، یان بژێوی نەدات، یان خراپ جوولانەوە لەگەڵ ئافرەتەکە، یان نەفرەت لەیەکتری کردن بو لادانی تۆمەت وبوهتان لەسەر یەکتری.[2]

1ـ المرغياني، الهداية، 247/1.
2ـ المرغياني، الهداية 11/2.

**چوارەم: ئافرەت یەکسانە لە یاسای شارستانی وتاوانەکان، بۆ پاراستنی نەفس ومالْ وناموس.**

**پێنجەم: چاودێری منداڵ**

ئافرەت مافی هەیە کە منداڵەکەی خۆی پەروەردە بکات پاش ئەوەی تەلاقدرا، ئەگەر ئافرەتەکەش مرد ئەوا خزمێکی نزیکی ئەو ئافرەتە مافی زیاترە بۆ لەئامێزگرتنی منداڵەکە، وەك: دایکی خوشکی، پوری، واتە خزمەکانی ئافرەتەکە شیاوترن لە خزمانی پیاوەکە.[1]

ئەوەش گرنگی دایکایەتی لە ئیسلام دەردەخات، چونکە زۆر لەدایکان ئاستی سوزیان زۆر بەرزە، کاتێ منداڵەکانیان لێ دوور دەخرێتەوە ئەوا تووشی نەخۆشی دەرونی وجەستەیی دەبن، هەر بۆیە ئاینی ئیسلام بەچاوی سۆزو بەزەییەوە دەڕوانێتە ئەو سۆزەی دایکایەتی، هەر بۆیە دایکی لە پێشتر داناوە بەچاودێری کردنی منداڵەکەی دوای مردنی پیاوەکە یان تەلاق ودابڕان. لە هەندێ لە مەزهەبەکان ئەو چاودێرییەی دایك بۆ منداڵەکەی تاوەکو 7– 9 ساڵە[2]، یان تاوەکو تەمەنی پێگەیشتنە،[3] یان تاوەکو تەمەنی ژن هێنانە بۆکوڕو بێ نوێژیە بۆ کچان.[4]

ئەگەر منداڵێك هۆش وبیری تەواو نەبوو ئەوا هەروەك منداڵێکی بچوك مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت، بۆیە لای دایکی دەمێنێ بۆ ماوەیەکی درێژتر، بەهۆی نەبوونی توانای جیاکردنەوەی کارو شتەکان.[5]

---

1ــ يكون ترتيب جدول الأولويات كالآتي: 1- الأم 2-الجدة للأم 3-الخالات 4-الجدة لأب-ثم أمها- 5- الأخوات 6- العمات ثم أقرب الأقربين حسب درجة القربى.

الجزيري، الفقه على المذاهب الأربعة ،594/4. والدسوقي، حاشية الدسوقي،526/2.

2ــ ابن قدامة، المغني، 300/9.

3ــ المرزوقي، حقوق الإنسان في الإسلام، ص238.

4ــ ابن العابدين، رد المحتار، 640/2.

5ــ الشافعي، الأم، 234/8.

لەو بابەتانەی باسمان کردن دەردەکەوێ کەوا ئافرەت لە ئیسلامدا کەسایەتیەك وکیانەك وبوونەکی سەربەخۆی هەیە، ئیرادەی ئازادە، ئیسلام نایەوێت بیلکێنێ بەکەسانی ترەوە، نازناوو ئیرادەی پەیوەست بێ بە پیاوەوە، بەو شێوەیە کەرامەت وبوونی پارێزراو دەبێت لەناو کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی کە هەردەم ئاواتی بەرزی وخۆش بەختەوەری ئەوە، هەردەم وەك قەڵغانێکی پتەوە بۆ بەرگری کردن لە مافەکانی.

# باسی سێیەم

# مافی فێربوون وهەندێ مافی تر

### بەندی یەکەم: مافی خوێندن وفێربوون ( حق التعليم )

بەدرێژی باسی مافی خوێندن وفێربوونی ئافرەت دەکەین لە بەشی پێنجەمی ئەو کتێبە.

### بەندی دووەم: مافی بیروڕا دەربڕین ( حق إبداو الرأی )

ئیسلام چۆن یەکسانی کردووە لە مرۆڤایەتی وکەسایەتی وئیرادە، ئاواش یەکسانی کردووە لە مافی ڕا دەربڕین وپەسەند کردنی ڕایە جوانەکان ولەبارەکان.

### بڕگەی یەکەم: مافی بیروڕا دەربڕین لە کارە تایبەتەکان

(إبداء الرأي في الشؤون الخاصة)

باشترین نموونە لەسەر ئەو جۆرە مافە ڕووداوی خویلەی کچی ثعلبة ﵂ هەروەك خۆی دەیگێڕێتەوەو دەڵێ ئەو ئایەتە لەسەر من وهاوسەرەکەم ئەوس کوڕی صامت﵁ دابەزی، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾ المجادلة: 1.

ئەو ئافرەتە دەڵێ: ڕۆژێك مێردەکەم هاتە لام، منیش داوای شتێکم لێکرد، ئەویش توڕەبوو، ووتی: تۆ وەك پشتی دایکمی، منیش ڕاستەوخۆ هاتمە لای پێغەمبەری خواﷺ باسەکەم بۆ گێڕایەوە، ئەویش ووتی: ئەی خەولە هاوسەرەکەت کوڕی مامی خۆتەو پیر بووە، تەقوای خوا بکەو باسی مەکە، زۆری نەخایاند قورئان دابەزی لەسەر ئەو بابەتەی من کێشەم تیایدا هەبوو. پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((ئەی خەولە، خوای گەورە دەربارەی تۆو هاوسەرەکەت ئایەتی ناردە خوارەوە))، پاشان ئایەتەکانی خوێندەوە :((يا خولة قد أنزل الله فيك وفي صاحبك قرآناً)).[1]

عائیشە دەڵێ ﵂: سوپاس بۆ ئەو خوایەی گوێی لە هەموو گفتوگۆیەکە، کاتێ خەولە هاتە لای پێغەمبەری خواﷺلە تەنیشت ماڵی خۆمان، من گوێم لە گفتوگۆیەکەیان نەبوو، بەڵام خوای گەورە، ئاگادار بوو بەو کێشەیەو لە بەرزی حەوت

---

1ـ الطبري، جامع البيان، 8/14. ابن كثير، تفسير القرآن العظيم، 270/4.

ئاسمانان،[1] ئایەتی دابەزاند تاوەکو مافی ئەو ئافرەتە بدات، کە هاوسەرەکەی دەیویست مافی هاوسەرێتی پێشێل بکات. لێرەوە چەند خاڵێکمان بۆ دەردەکەوێت:

1- بۆمان دەردەکەوێ کەوا ئافرەت لای پەروەردگار چەند بەرێزە.

2- چونکە ئافرەت ئاستی سۆزی بەرزە ودەرونی ناسکە، بەرگەی کێشەکانی خێزانی ودەرونی ناگرێت، بۆیە خوای بەزەیی ڕاستەوخۆ، لە هەمان کات مافی دابین کرد.

3- ئافرەت مافی ئەوەی هەیە ڕای خۆی بدات وبەرگری لە خۆی بکات ئەگەر لە توانای بوو، ئەگەر نا، کێشەکەی بەرز بکاتەوە بۆ سەروی خۆی بۆ دۆزینەوەی ڕێگە چارەیەك.

4- زۆر کێشەی کۆمەڵایەتی ڕووی لە پێغەمبەرو هاوەڵەکانی کردووە، خوای گەورە ئاوا ڕاستەوخۆ قورئانی دانەبەزاندووە، بەڵکو دواکەوتووە بۆ ماوەیەك لەبەر ئەو حیکمەتانەی خۆی دەیزانێ، بەڵام لەو کێشەیە ڕاستەوخۆ وەڵام دابەزی مافی ئافرەتەکە دابین کرا، چ ڕێزێك وبەرزی وئازادیەك هەیە بۆ ئافرەتان لەوە گەورەتر بێ کە پەروەردگار خۆی چارەسەری کێشەی بکات ومافی دابین بکات.

**برگەی دووەم: مافی بیرورا دەربڕین لە کاروباری گشتی**

1- (إبداء الرأي في الشؤون العامة)

ئاینی ئیسلام مافی ئافرەتی داوە کەوا ڕای خۆی دەربڕێ کاتی هاتنە پێشەوەی ڕووداوێکی گشتی کۆمەڵایەتی، پەروەردەیی، ڕامیاری، فەرهەنگی بێت، ئەگەر ڕایەکەشی پەسەند بوو، ئەوا ئەو ڕایە وەردەگیرێ ولەسەر هەموو موسڵمانان پێویستە پێوەی پابەند بن کاتێ بووە بڕیاری گشتی. بۆ ئەو جۆرە مافانەش نموونەمان زۆر زۆرە لە مێژووی ئیسلامدا، تەنها بۆ نموونە چەند دانەیەکیان باس دەکەین:

---

1- الطبري، جامع البيان ، 14/8-9.

لــە دوای واژووکردنــی پەیمانــی حدیبیــە[1] لەلایـــەن پێغەمبـــەری خــوا ﷺ، بــە هاوەڵەکانی فـەرموو کـەوا دەسـت بکـەن بـە سـەرتاشـین وسـەربڕینی ئاژەڵـەکان، ئـەو فەرمانە لەسەر دڵی هەندێکیان قـورس بـوو، چـونکە خۆیـان ئامـادەکردبوو بچنە نـاو مەککـەو عـەمرە بکـەن، نـەوەك بگەڕێنـەوە بـۆ مەدینـە بـەبێ ئـەوەی عـەمرە بکـەن. ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ سێ جار ئەو فەرمایشتەی دووبارە کردەوەو هـیچ کـەس ئـەو دوو کـارەی ئـەنجام نـەدا، ئـەویش چـووە لای ئـوم سـەلەمەی ﵂ خێزانـی ئـەو ڕووداوەی بۆ گێڕایەوە، ئوم سەلەمە ﵂ ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بڕۆ بـۆ نـاو هاوەڵەکان و قسە لەگەڵ کەسیان مەکە، بانگی سەرتاشـەکەت بکـە و دەسـت بکـە بـە سەر تاشین وسەربڕینی ووشترەکان، کاتێ ئەوان تۆیان بینی بەم شێوەیە خۆیـان چـاو لە تۆ دەکەن وپێویسـت بـە پـێ گـووتن ناکـات. ئینجـا هاوەڵـەکان دەسـتیان کـرد بـە سەرتاشـینی یـەکتری وسـەربڕینی ووشـترەکان، هەنـدێکیان لـە داخـی ئـەوەی کـە ڕاستەوخۆ فەرمانی پێغەمبەری خوایـان ﷺ جێبـەجێ نـەکرد خـەریك بـوون یـەکتریان دەکوشت.[2]

بەو ڕایە پەسەندو جوانەی ئەو ئافرەتە لەو کاتە ناسکەدا، بوە هۆی دامرکاندنەوەی ئاژاوەیەکی گەورەو تووش بوونی هاوەڵانی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـە سـەرپێچی کردنـی فەرمانەکانی وگوناهباربوونیان.

هەروەك لە زۆر شوێنی تر باسی ئەوەمان کردووە، ئافرەتانیش زۆرجار لـەکاروباری ڕامیاری وبگرە سـەربازیش بیروبۆچـۆنی جوانیـان بـە مێشکدا دێت کـە دەبێتـە هـۆی دامرکاندنـــەوەی ئاژاوەیـــەك، یـــان ســـەرکەوتنی بەرنامەیـــەك، یـــان دەربـــاز بـــوون لەتەنگژەیەك، وەك ئەوانەی بینیمان لە خوشکی موسی پێغەمبەر ﵇ ئاسیای خێزانـی فرعەون و پاشای (ملكة سبأ).

1ــ الحديبية: گوندێکە ناودەبرا بە بیر، هەر لەو شوێنە پێغەمبەری خوا ﷺ پەیمانی لە هاوەڵەکانی وەرگرت، لەنێوان ئەو شوێنەو مەککە تەنها یەك قۆناغە، بەڵام تۆ قۆناغ لە مەدینـەوە دوورە. الحموي، يــاقوت، معجــم البلدان، 1309/2.

2ــ المباركفوري، الرحيق المختوم، ص343.

## بەندی سێیەم: مافەکانی تری ئافرەت (بعض حقوق اخرى)

## بڕگەی یەکەم: تەمەنی منداڵی وپێگەیشتن وشووکردن

### یەکەم: پارێزگاری لە ژیانی ئافرەت (الحفاظ على حياة الأنثى)

لە زۆر سەردەمانی نەفامی نەتەوەی عەرەب ونەتەوەکانی تر، منداڵی مێینە زیندەبەچاڵ دەکرا، یان پشت گوێ دەخرا تاوەکو گیانی لە دەست دەدا، ئەوەش لەبەر نەبوونی بژێوی بوو، یان لە ترسی ئەوەبوو بکەوێتە دەست هۆزە هێرش بەرەکان، یان لەبەر ئەوەبوو ئافرەتان بەشداری جەنگیان نەدەکرد تاوەکو تاڵانی پەیدا بکەن وەك پیاوان بۆیە زۆر بە پێویستیان نەدەزانی.

خوای گەورە فەرمانی کرد بەو هەژارانە، ئەگەر ئێوە لە بارێکی ئابووری ئاسایدا بوون ومنداڵێکی مێینەتان بوو، ئەوا زیندەبەچاڵی نەکەن لەترسی برسیەتی، چونکە خوای گەورە بژێوی (ئەو کچە) و ئێوەش دەدات، هەروەها ئەگەر ئێوە لەباری برسیەتی دابوون ومنداڵێکی مێینەتان بوو، ئەوا زیندەبەچاڵی مەکەن، چونکە خوای گەورە بژێوی (ئێوە) و ئەویش دەدات. کوشتنی نەفسێك لەهەر ڕەزێکدا بێت لای خوای گەورە زۆر قورسە، چونکە پێچەوانەی بنچینەی حیکمەتی خوایە لە خولقاندن ونیشتەجێ کردنی ئادەمیزادان لەسەر زەوی.

خوای گەورە دەفەرمووێ بەچی تاوانێك ئەو منداڵانە دەکوژن، کاتێ لە ڕۆژی پاداشت وسزا پرسیارتان لێدەکرێت چ وەلامێك دەدەنەوە، تاوانیان چیە؟ ئایا ڕق وبوغزی بەدەست ئێوەیە؟ ﴿وَإِذَا ٱلْمَوْءُۥدَةُ سُئِلَتْ ۝٨ بِأَىِّ ذَنۢبٍ قُتِلَتْ﴾التكوير: 8-9. خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَـٰدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَـٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ ۚ إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْـًٔا كَبِيرًا﴾الاسراء: 31. خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَـٰدَكُم مِّنْ إِمْلَـٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ﴾الأنعام: 151.

**دووەم: توڕەیی ونەفرەتی خوا بۆ ئەو کەسەیە سووکایەتی بە ئافرەت دەکات (تغلیظه سبحانه على من يحتقر الأنثى)**

خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِالْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٥٨﴾ يَتَوَارَىٰ مِنَ الْقَوْمِ مِن سُوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ ۚ أَيُمْسِكُهُ عَلَىٰ هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرَابِ ۗ أَلَا سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٥٩﴾ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ مَثَلُ السَّوْءِ ۖ وَلِلَّهِ الْمَثَلُ الْأَعْلَىٰ ۚ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾ النحل: 58-59.

نەفامەکانی پێش ئیسلام لە نەتەوە جیاجیاکان، کاتێ منداڵێکی مێینەیان دەبوو زۆر دڵگران دەبوون، دەم وچاویان ڕەش هەڵدەگەڕا کاتێ ئەو هەواڵەیان دەبیست. ئەو نەفامانە دوو ڕێگەیان دەگرتە بەر، یەکەمیان: زیندەبەچاڵ کردن، دووەم: هێشتنەوەی لە ماڵ بەڵام بەچاوێکی زۆر سووک تەماشا دەکرا، پشت گوێ دەخرا.

ئیسلام ئەو تێڕوانینە هەڵانەی هەبوون دەربارەی ئافرەت ڕاستی کردەوە، بۆی شیکردنەوە کەوا نێرینەو مێینە بەخشراوێکی خوایی یە، هەر سووکاتیەك بەرامبەری بکرێت ئەوا سووکایەتیە بەڕەگەزی پیاو خۆی و سوکایەتیە بە مرۆڤایەتی، چونکە ئافرەت یان دایکیەتی یان خوشکیەتی یان پوریەتی یان هاوسەریەتی.

**سێیەم: چاکەکردن بەرامبەری (الإحسان إليهن)**

لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕنەوە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺفەرموویەتی: ((ئەو کەسەی مێینەی هەبوو، لەگەڵیان باش بوو، ئەوا دەبنە بەربەست بۆی لە ئاگری دۆزەخ)) ((مَن ابتلى منَ البنات بشيء، فأحسن إليهن كنَّ له ستراً من النّار)).[1]

لە ئەبو سەعیدی خودریەوە﵁ دەگێڕنەوە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئەوەی سێ یان دوو کچی هەبێ یان خوشکی، لەگەڵیان باش بوو، تەقوای خوای کرد لەو بارەیەوە، ئەوا بەهەشتی پێ دەبەخشرێ)) ((من كان له ثلاثة بنات أو ثلاث

---

1 ـ النيسابوري، مسلم بن حجاج ، صحيح مسلم، 45-كتاب البر والإحسان باب: 47 حديث رقم: 2632 ، 5 /2554.

أخوات أو ابنتان أو أختان فأحسن صحبتهن واتقى الله فيهن فله الجنة)) .[1]

له ئیبن وعەباسەوە ﷺ دەگێڕنەوە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئەوەی کچێکی هەیە، زیندەبەچاڵی نەکرد، بەیەکچاو تەماشای کرد لەگەڵ کوڕەکان وجیاوازی نەکرد، ئەوا خوای گەورە پاداشتی بە بەهەشت دەداتەوە))

(( من كانت له أنثى فلم يئدها ولم يهنها ولم يؤثر ولده عليها لأدخلنّه الله الجنة)).[2]

**چوارەم: مافی مێینەی هەتیوو ( حقوق اليتامى من النساء )**

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي ٱلنِّسَآءِ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ وَمَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فِي ٱلْكِتَٰبِ فِي يَتَٰمَى ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِي لَا تُؤْتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلْوِلْدَٰنِ وَأَن تَقُومُوا۟ لِلْيَتَٰمَىٰ بِٱلْقِسْطِ ۚ وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِهِۦ عَلِيمًا ﴾ النساء: 127.

لە سەردەمانی نەفامی ئەگەر پیاوێك هەتیوێکی مێینەی لابوو، ئەوا پارچە قوماشێکی بەسەردا دەدا، ئەوا بۆ کەس نەبوو داخوازی بکات، ئەگەر جوان وبەرچاوبوایە ئەوا بۆ خۆی داخوازی دەکرد، ئەو کات هەموو ماڵی داگیر دەکرد، ئەگەر جوان نەبوایە ئەوا دەیهێشتەوە تاوەکو دەمرد، ئەوەش بۆ ئەوەبوو تاوەکو ماڵەکەی بخوات. ئینجا خوای بەزەیی ئەو داب ونەریتە نەفامیەی بەلاوەنا، فەرمووی ئەوانەش مافی میراتیان هەیە، مافی ئەوەیان هەیە چاکەیان لەگەڵدا بکرێت وڕێگەیان نەگیرێت بۆ شووکردن. هەروەك لە زۆر ئایەتەکانی (سورة النساء) الأية(11- 12-176).

---

1ـ المنذري، الترغيب الترهيب، 68/3. ومسند أحمد، 223/1. والناصف، التاج الجامع للأصول، 8/5، باب بر الوالدين.

2ـ البخاري: 78- الأدب باب: 41 الحديث: 7 ،159/1. ومسند أحمد، 154/4، والناصف، التاج الجامع للأصول، 8/5.

**پێنجەم: هەوڵدان بۆ دیاری کردنی هاوسەرێکی چاك بۆی**

**شەشەم: پێدانی مارەیی**

**حەوتەم: پێدانی بژێوی**

ئەو خاڵانە باسکران لە باسی شیاوی ئافرەت لە بوارە جیاجیاکان.

دادوەری کردن لە نێوانیان ئەگەر پیاوەکە زیاتر لە یەك خێزانی هەبوو. خوای گەورە چەند ژنی حەڵاڵ کردووە بۆ موسڵمانان، هەروەك لە زۆربەی ئاینەکان و کۆمەڵگەکانی هەبووە(ئەو بابەتە بەدرێژی باسکراوە لە کتێبی – پیاوان وژنان تەوکاری نا یەکسان– دانەر) بەمەرجی هەوڵدان بۆ یەکسانی دادوەری کردن لە نێوانیان لە خواردن وپۆشاك و شوێن ومامەلە کردن، هەرچەندە ئەگەر ئەو ئافرەتانە لە باری ئابووریەوە جیاوازیان هەبوو. بەڵام هەندێ شتی تر هەیە کە لە ژێر کۆنترۆل ودەسەلاتی مرۆڤدا نیە ئەویش دڵ بۆچوون وخۆشەویستی دڵیە، لەگەڵ ئەوەشدا نابێ مافی ئەوانی تر پێشێل بکات.

لە ئەبو هورەیرەوەﷺ دەگێرنەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:(( هەریەکێك دوو خێزانی هەبێ زۆر بەلای یەکیاندا لار بۆوە ئەوا رۆژی دوایی دەبینین لار بۆتەوە بۆ لایەك)) ((من كانت له امرأتان فمال إلى إحداهما جاء يوم القيامة وشقه مائل)).[1] لە ڕوایەتەکی تردا دەفەرموویێ: لایەکی کەوتووە لەبەر زۆری لار بوونەوە. بۆیە لەسەر موسڵمان پێویستە بەلای یەکێك لە خێزانەکانی زۆر لار نەبێتەوەو ئەوی تریان پشت گوێ بخات، چونکە وەك ئافرەتێکی هەڵواسراو دەبێت، نە هاوسەری هەیە بچێتە لای، نە تەلاقدراوە تاوەکو شوو بکاتەوە، خوای گەورە دەفەرموویێ: ﴿ وَلَن تَسۡتَطِيعُوٓاْ أَن تَعۡدِلُواْ بَيۡنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوۡ حَرَصۡتُمۡۖ فَلَا تَمِيلُواْ كُلَّ ٱلۡمَيۡلِ فَتَذَرُوهَا كَٱلۡمُعَلَّقَةِۚ ﴾ النساء: 129.

---

1ـ صحيح ابن حبان الرقم: 4207، 7/10. وابن ماجه باب: القسمة بين النساء الرقم:1969، 633/1. سنن الكبرى للبيهقي الرقم: 8890، 280/5.

**هەشتەم: مامەڵە کردن بەچاکی (المعاشرة بالمعروف)**

چاکی مامەڵەکردن پێویستیەکی ئیسلامیە، بەتایبەتی لەگەڵ خێزان، چونکە هۆکاری نزیك بوونەوەی دڵەکانە، تەواوکاری باوەڕە، زیاد بوونی تەقواو ئارامیە.

لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەگێڕنەوە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((أكمل المؤمنين إيماناً أحسنهم خلقاً، وخياركم خياركم لنسائه)).[1]

خوای گەورە فەرمانی ئەوەشمان پێدەکات کەوا کاتێ پیاو کەوتە قین لە هاوسەرەکی، ئەوا بۆی نیە مامەڵەی خراپی لەگەڵدا بکات، چونکە خۆی نازانێ لەوانەیە بەهۆی ئەو ئافرەتەوە خێرێکی گەورەی بۆ بێت لەلایەن خوای گەورە، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ فَإِن كَرِهۡتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَيَجۡعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيۡرٗا كَثِيرٗا﴾ النساء: 19.

**نۆیەم: مافی دانانی دادوەر**

ئافرەت کاتێ دووبەرەکی هەبوو لەگەڵ هاوسەرەکەی دەتوانێ دادوەرێك لە خزمەکانی خۆی بهێنێ بۆ بەرگری لێکردنی. خوای گەورە بۆ چارەسەری کێشەو ناکۆکی ودووبەرەکی نێوان هەردوو هاوسەر چەند قۆناغێکی داناوە: ئامۆژگاری کردن، دوورکەوتنەوە لە کاتی خەوتن، لێدانێکی سووکی سەرزەنشتکارانە. خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَٱهۡجُرُوهُنَّ فِي ٱلۡمَضَاجِعِ وَٱضۡرِبُوهُنَّۖ فَإِنۡ أَطَعۡنَكُمۡ فَلَا تَبۡغُواْ عَلَيۡهِنَّ سَبِيلًاۗ﴾النساء: 34.

ئەوەش واتای ئەوە دەدات ئافرەتان مافیان هەیە بەرگری بکەن لە خۆیان کاتی بوونی کێشەکان، نەوەك تەنها فەرمانی پیاو بەسەریدا بدرێت هەرچەندە ئەگەر ناڕەواش بێت. خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَإِنۡ خِفۡتُمۡ شِقَاقَ بَيۡنِهِمَا فَٱبۡعَثُواْ حَكَمٗا مِّنۡ أَهۡلِهِۦ وَحَكَمٗا مِّنۡ أَهۡلِهَآ إِن يُرِيدَآ إِصۡلَٰحٗا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيۡنَهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرٗا﴾ النساء:35/4.

---

1ـ الطبراني، المعجم الأوسط، الرقم: 4420 ، 356/4.

**دەیەم: لە کاتی ڕوودانی تەڵاق (حالة حدوث الطلاق)**

لە سەردەمانی نەفامی تەڵاقدان بێ ژمار بوو، پیاو ئافرەتی تەڵاق دەدا دوایی لە ماوەی عیدە دەیگێڕاوە، دوایی دووبارە تەڵاقی دەداوە بە ئارەزووی خۆی، ئەو کردارە ژمارەیەکی زۆرجار دووبارە دەبۆوە، کە تیایدا ئافرەت هەردەم لە ژیانێکی لاسەنگی دەرونی دەژیا، نەیدەزانی دواڕۆژی ژیانی خۆیی وکۆرپەکانی بەچی دەگات. هەر بۆیەش خوای بەزەیی ژمارەی تەڵاقدانی دیاری کردوو چوارچێوەیەکی بۆ دانا تاوەکو پیاوانی نەزان وبێ بەزەیی بە ئارەزووی خۆیان گاڵتە وسووکایەتی بە کەسایەتی وکەرامەتی ئافرەتان نەکەن، هەروەك دەفەرمووێ: ﴿ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ وَلَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَأۡخُذُواْ مِمَّآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ شَيۡـًٔا﴾البقرة: 229.

هەروەها بۆی دیاری کردن کەوا کاتی نزیك بوونەوەی عیدەی یان دەیگەڕێنتەوە ژێر سێبەری خۆی، یان بەردەوام دەبێت تاوەکو دەگاتە بەینوونە، بەبێ ئازاردان، یان وەرگرتنی فیدیە، یان ڕاگیرکردنی.

خوای گەورە دەفەرمووێ:﴿وَإِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمۡسِكُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٖۚ وَلَا تُمۡسِكُوهُنَّ ضِرَارٗا لِّتَعۡتَدُواْۚ﴾البقـــــرة: 231.خـــوای گـــەورە دەفـــەرمووێ:﴿فَلَا تَعۡضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحۡنَ أَزۡوَٰجَهُنَّ إِذَا تَرَٰضَوۡاْ بَيۡنَهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِۗ﴾البقــــرة: 232.

**یانزەم: پاش لێك دابڕان مافی پێدەدرێت (بعد الانفصال تأخذ حقها)**

کاتێ پەیوەندی نێوان هەردوو هاوسەر گەیشتە ئەو ئاستەی کەوا نەتوانن پێکەوە ژیان بەسەر بەرن، ئەوا چارەسەر نیە تەنها دەست لێك بەردان نەبێت، ئەوا لەو کاتیش ئافرەت ئەو مارەییەی بۆی بڕاوەتەوە وەردەگرێ هەرچەندە بڕێکی زۆریش بێت، ئەوەی بڕێك لەو مارەییە بگێڕێتەوە ئەوا نا ڕەواییە وتاوان وبوختانە. خوای گەورە دەفـــەرمووێ: وَإِنۡ أَرَدتُّمُ ٱسۡتِبۡدَالَ زَوۡجٖ مَّكَانَ زَوۡجٖ وَءَاتَيۡتُمۡ إِحۡدَىٰهُنَّ قِنطَارٗا

فَلَا تَأْخُذُواْ مِنْهُ شَيْـًٔاۚ أَتَأْخُذُونَهُۥ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴾النساء: 20.

**دوانزەم: کاتی شیرپێدان بژێوی وپۆشاکی لەسەر باوکی منداڵەکەیە (للمرضعة حق النفقة والکسوة بعد الانفصال)**

چونکە منداڵ پێویستی بە شیر خواردن هەیە بۆ ماوەی دوو ساڵ، ئەگەر لەو ماوەیە ئەو ئافرەتە تەڵاقدرا، ئەوا ئەو دایکە بۆی هەیە بۆ ماوەی دوو ساڵ ئەو منداڵە شیر بدات، تاوەکو ئەو منداڵە لەو شیرە چاکە ولە سۆزی دایکایەتی بێبەش نەبێت. لەلایەکی ترەوە لەسەر باوکی منداڵەکە پێویستە بژێوی وپۆشاکی ئەو ئافرەتە دابین بکات لەو ماوەیە. ئەو هاوکاریەش لە نێوان ئەو دوو هاوسەرە بۆ بەرژەوەندی منداڵەکەیە.

خوای گەورە دەفەرمووێ:﴿ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَۚ وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِۚ ﴾ البقرة: 233.

**سێزدەم: پاش کۆچی دوایی هاوسەر ئافرەت مافی خۆی هەیە**

لە سەردەمی نەفامی دوای مردنی پیاو، خێزانەکەی لەبارێکی زۆر ناخۆش دەژیا، چونکە زۆربەی جار بێبەش دەکرا لە میرات، لەلایەن پیاوەوە ڕێگەی پێنەدەدرا ونەیدەتوانی شوو بکاتەوە تاوەکو سامانەکەی بخوات. بەڵام لە ئاینی ئیسلام پاش مردنی هاوسەر ئافرەت دەتوانێ بە ئارەزووی خۆی شوو بکاتەوە، بۆ کەسیش نیە لە بەشە میرات بێبەشی بکات. خوای گەورە دەفەرمووێ:﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًاۖ وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُواْ بِبَعْضِ مَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ ﴾ النساء:19،خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًاۖ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ فِىٓ أَنفُسِهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾البقرة: 234.

## بڕگەی دووەم: قۆناغی دوای شووکردن - دایکایەتی

**(مرحلة ما بعد الزواج – مرحلة الأمومة- حقوق الوالدين)**

### یەکەم: چاکەکردن لەگەڵ دایك وباوك (الإحسان إلى الوالدين)

خوای گەورە بەندایەتی ئادەمیزادی پەیوەست کردووە بە چاکە کردن وڕێزگرتنی دایك وباوك. لەبەر بەرزی ئەو دوو کەسایەتیە، خوای گەورە لەسەر منداڵەکانی واجیب کردوو کەوا باش وچاك بن لەگەڵ دایك وباوکیان، خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا﴾الإسراء: 23.

لە مەهران کوڕی حەکیم[1] ﷺ، کەوا باپیری بە پێغەمبەری خوای ﷺ گوتووە: لەگەڵ کێ باش بم؟ ئەویش فەرمووی: ((لەگەڵ دایکت))، تاوەکو سێ جار دووبارەی کردووە، جاری چوارەم فەرمووی: (( لەگەڵ باوکت، دوایی خزمەکانی نزیك)) ((أباك ثم الأقرب فالأقرب)).[2]

### دووەم: بەشی دایك وباوك بدرێت ئەگەر وەسیەت کرا

خوای گەورە دەفەرمووێ:﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ ﴾ البقرة: 180.

### سێیەم: سوپاسگوزاری دایك وباوك

خوای گەورە دەفەرمووێ : ﴿أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴾لقمان: 14.

ئەو ئایەتانە ئاراستەمان دەکەن وفەرمانمان پێدەکەن کەوا سوپاسی دایك وباوکان بکەین، مامەلەی جوان، بە شێوەیەکی جوان گوزەرانیان لەگەڵ بکەن، هەرچەندە ئەگەر بێ باوەڕیش بوون.

---

1ــ مهران بن حكيم: ناوی کیسانەو تەنها ئەو فەرموودەی گێڕاوەتەوە. ابن حجر، الإصابة، 446/3 .
2ــ الطبراني، المعجم الصغير، حديث رقم 627، ص268.

**لە ئەسمای کچی ئیمامی ئەبی بەکر ﷺ دەگێڕنەوە دەڵێ: دایکم هاتە مەدینە بۆ لام لەو کات بێ باوەڕ بوو، منیش چوومە لای پێغەمبەری خواﷺ، ووتم: دایکم هاتووتە مەدینە، ئایا دەتوانم بچم بۆ لای؟ ئەویش فەرمووی: (( بەڵێ رەحم وبەزەیی بکەیەنە)) ((نعم، صلي أمك)).** [1]

**چوارەم: سزا بۆ ئەوانەی خراپن لەگەڵ دایك وباوك**

**(الترهيب في عقوق الوالدين)**

**لە مغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەگێڕنەوە[2]، کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((خوای گەورە ئازاردان وگوێڕایەڵ نەبوون بۆ دایك وباوکی حەرام کردووە، دەست والاکردن ودەست گرتنەوە، زیندەبەچاڵی منداڵی بۆی ناپەسند کردوون: زۆر گووتن، زۆر پرسیار کردن، بە فیڕۆدانی سامان)) ((إن الله حرّم عليكم عقوق الأمهات، ومنعاً وهات، ووأد البنات، وكره لكم: قيل وقال، وكثرة السؤال، وإضاعة المال)).** [3] **لە عەبدولرەحمان کوڕی بەکرە ﷺ** [4] **دەگێڕنەوە، کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (( ئایا پێتان بڵێم گەورەترین گوناه چی یە)) ((ألا أنبئكم بأكبر الكبائر)). گووتمان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خواﷺ، ئەویش فەرمووی: (( هاوبەش پەیداکردن بۆ خودا، خراپ هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ دایك وباوك)) (( ألاّ تشرك بالله، وعقوق الوالدين...)).** [5]

---

1ـ البخاري، 81- كتاب: الأدب ، باب: 8 حديث 5634، 223/5.

2ـ مغيرة بن شعبة بن عامر: لە هاوەڵە بەڕێزەکانە، خاوەنی زیرەکی وهێزو فێڵ بووە، لە پەیمانی حودەیبیە بەشدار بووە، لە جەنگی یەرموك چاوێکی لە دەست داوە، لە ساڵی 50ك کۆچی دوایی کردووە .ابن حجر، الإصابة، 131/6. والذهبي، سير أعلام النبلاء، 21/3.

3ـ البخاري 81- الأدب باب:6 الرقم:5630، 229/5. ومسلم:30-الأقضية باب:5 حديث12-1715، 1795/4.

4ـ عبد الرحمن بن بكرة الثقفي: لە تابعینەکانە، لە سەردەمی زیاد کوڕی باوکی هەندێ پۆستی وەرگرتووە، لە ساڵی 96ك کۆچی دوایی کردووە. الزركلي، الأعلام، 302/3.

5 البخاري:81- الأدب، باب:6 الحديث :5631، 229/5. ومسلم:1-الإيمان باب:38 الرقم:143-87، 234/1. ومسلم: 1-الإيمان، باب: حديث 143-87، 234/1.

**پێنجەم: بژێوی دابین کردن بۆ دایك وباوك (النفقة للوالدين)**

هۆکارێکە بۆ هاوکاری وپاڵپشت کردن ودەست باری گرتنی یەکتری، هۆکاری پاککردنەوەی دڵ و دەروونە، پتەوکردنی پەیوەندی نێوان ئەندامانی خێزان و کۆمەڵگەیە. هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ کەوا نزیکترین کەس بە هاوکاری و بژێوی دابین کردن دایك وباوکە: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلْ مَآ أَنفَقْتُم مِّنْ خَيْرٍ فَلِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ ﴾البقرة:215/2.

**شەشەم: بەشە میرات بۆ دایك و باوك (الميراث للوالدين)**

خوای گەورە دایك وباوکی بێبەش نەکردووە لە میراتی منداڵەکانی یان براو خوشکی، هەروەك لە ئایەتەکانی سورەتی بەقەرەدا هاتووە:﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوْلَٰدِكُمْ ۖ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۚ ﴾ النساء: 11، 12، 176.

ئەو هەموو مافانەی باسمان کردن کەوا ئافرەتان تیایدا بەشدارن لە هەموو تەمەنەکانی ژیانی بەبێ جیاوازی، بۆمان ڕوون دەبێتەو دەگەینە ئەو باوەڕەی کەوا خوای گەورە بە شەریعەتی ئیسلام دەستی ئافرەتی گرتووەو بەرزی کردۆتەوەو دەریهێناوە لە ژیانێکی ناخۆش وسەخت وتاریك، هەروەها لە دواڕۆژێکی نادیار بۆ ئاسۆیەکی ڕوناك، لە بێبەشی سامان وخەرجی، بۆ خاوەنی میرات وبژێوی وکاروکاسبی حەڵاڵ وگونجاو، لە زیندەبەچاڵی بۆ هاوشان بوون لەگەڵ پیاو لە مرۆڤایەتی، لە خزمەتکارێکی بێ نەوازە بۆ خزمەت کردن وژیان دابین کراو، لە نەبوونی شیاوی و کەسایەتی بۆ بوونێك وکەساتیەکی سەربەخۆ، لە تاریکی نەفامی بۆ ڕوناکی ئیسلام.

لە کۆتایدا باسی سێ ڕووداو دەکەین، کە لە سەردەمانی زوو ڕوویداوە، ئەو سەردەمانەی کە موسڵمانان خاوەن بەرنامە بوون، پابەندبوون بە فەرمانەکانی قورئان، کە تیایدا زۆر بە ڕوونی بۆمان دیار دەخات چۆن موسڵمانان ڕێزی ئافرەتیان گرتووە، ئەو هاوارەی ئافرەتێکی موسڵمان کردی، وای لە سەرکردە باوەڕدارەکان کرد سوپایەك ئامادە بکەن و بەدەم بانگەوازی ئەو ئافرەتە بچن، وانەیەکی ئاواش بدەن بە

دوژمن کە تا چەندەها سەدە نەتوانن نەك سووکایەتی بە ئافرەتی موسڵمانان بکەن، بەڵکو نەتوانن هەر تەماشایان بکەن، یان ناویان بە خراپە ببەن.

ئەو غیرەتەی موسڵمانان نواندیان لەو ڕووداوانەدا، بریتیە لە فیترەی خۆڕسکی هەموو ئادەمیزادێکی پاك، هەروەها سروشتی هەموو نەفسێکی ئازادو بەرز، هەروەها بریتیە لە بنچینەکانی ڕەوشت لە ئیسلامدا.

لەو ڕووداوانەدا جوانترین لاپەڕەی مێژووی ئوممەتەکەمان دەبینین کەوا چۆن موسڵمانان بەرگری دەکەن لە ئابڕوو وکەرامەتی ئافرەتان (دایك وخوشك وکچ و پور...)، هەروەها چۆن مافەکانیان دابین دەکەن.

یەکەم: ئافرەتێکی موسڵمان لە بازاری مەدینە چووە لای زێڕەنگەرێکی جولەکە، ئەویش ویستی دەم وچاوی خۆی بۆ دەربخات، ئافرەتە موسڵمانەکەش ئەو کارەی نەکرد، پاشان جولەکەکە سەرپۆشی ئافرەتەکەی لە دواوە بەستا، کاتی هەستاوە سەرپۆشەکەی کەوتە خوارەوەو ئەوانەی لەوێ بوون کەوتنە پێکەنین وگاڵتە پێکردنی. لەو کاتە ئافرەتەکە هاواری کردوو، موسڵمانان بەدەم هاوارەکەیەوە هاتن و جولەکەکەیان کوشت، دوایی جولەکەیەکی زۆر لە بەنی قەینوقاع کۆبوونەوەو پیاوە موسڵمانەکەیان کوشت، لەکۆتاییدا ژمارەیەکی زۆر لە هەردوولا کۆبوونەوە لە شوێنەکە، تا وای لێهات موسڵمانەکان جولەکانیان گەمارۆدا، دوایی پێکهاتن لەسەر ئەوەی کەوا جولەکەکان شاری مەدینە جێبهێڵن وبچنە سنوورەکانی شام.[1]

دووەم: لەساڵی 223 زاینی پاشای ڕۆمەکان، تەزفیل کوڕی میخائیل هێرشێکی کردە سەر خەڵکی مالطیە، ژمارەیەکی زۆر لە پیاو وژن ومنداڵی کوشت، هەروەها ژمارەیەکیی لە پیاو ئافرەتی بەدیل گرت، هەندێکی لەو دیلانەش کوشت، دوایی دەستی کرد بە دەهێنانی چاو، بڕینی گوێچکەو لووتی ژمارەیەکی تر. کاتێ خەلیفە موعتەصەم هەواڵی بە دیل گیرانی ئەو ئافرەتانەی بیست، لە کۆشکی خەلافەت بە هەموو دەنگیەوە هاواری کرد وگووتی: هەر ئێستە سوپام بۆ ئامادە دەکەن، خۆم

---

1ـ ابن کثیر، البدایة والنهایة، 4/4.

سەرکردەی هێرشی تۆڵە دەکەم، بانگی قازی وهەندێ لە پیاو ماقولانی کرد وەك شاهید و گووتی: سێیەکی ماڵ وسامانم بکەنە صەدەقە، سێیەکی دووەم بۆ منداڵەکانم، ئەوی تریش بۆ خزمەتکارو دەست وپێوەندەکانم.

کاتێ دەنگ وباسی بەدیل گیرانی ئەو ئافرەتانە بڵاوبۆوە لەناو موسڵمانان، غیرەتی ئیسلامەتیان جوولا بۆ ڕزگار کردنی ئەو دیلانە، بەمەش ژمارەیەکی زۆر لە جەنگاوەران بەشداریان کرد وسوپای ڕۆمیان تێکشکاند وئافرەکانیان لە بەندیخانە دەرهێناو جوانترین وانەی بەرگری کردن لە کەرامەت وئابڕووی ئافرەت نیشانی هەموو جیهاندا درا.[1]

سێیەم: لە سەدەی شەشەمی کۆچی و لەساڵی 564 کۆچی، خاچ پەرستان هەندێك لە خاکی میسریان داگیر کرد، پاش ئەوەی وەزیری فاتمیەکان کە ناوی (شاوەر) بوو خیانەتی لە خەلیفەی خۆیان (عاضد) کردو هاوکاری خاچ پەرستانی کرد بۆ هاتنە ناو خاکی ئیسلام. پاشان خەلیفەی فاتمیەکان لە قاهیرە هەستی بەوەکرد کەوا داگیرکەران نیازیانە زیاتر بێنە ناوەوەی میسر وهەمووی داگیر بکەن، بیری کردەوە کەوا نامەیەك بنێرێ بۆ والی شام (نور الدين الزنكـــي)، بەلام چۆن ئەو کارە بکات؟ زۆر دوودڵ بوو، چونکە والی شام دان نانێ بە خەلافەتی فاتمیەکان لە میسر، بەڵکو دان دەنێ بە خەلافەتی عەباسیەکان لە بەغدا. لەوکات بیری کردەوە کەوا پارچەیەك لە قژی کچە تاقانەکەی بنێرێ بۆ نورالدین لەگەڵ نامەیەك، ئەوەش ئەو واتایەی دەبەخشی کەوا هاناتان بۆ دەبەین وئافرەتەکانمان لە دەست خاچ پەرستان ڕزگار بکەن. ئەو نامەیە کاریگەریەکی زۆری هەبوو لەسەر دڵی نورالدین وهەموو ئەو ناکۆکی ودووبەرەکیەی پێشتر هەبوو لە نێوان شام ومیسر لە دیادی چوو، سوپایەکی ئامادەکرد بە سەرۆکایەتی شێری ئاین شێرکۆی ئەیوبی[2] بە هاوڕێیەتی صلاح الدینی

---

1 ـــ المصدر السابق، البداية والنهاية، 285/10، وما بعدها.

2 ـــ شیرکوه بن شادي : مامی صەلاحەددینە، یەکێك بووە لە سەرکردە متمانە پێکراوەکانی نورالدین مەحمود زەنکی ، ناردی بۆ میسر بۆ هاوکاری فاتمیەکان دژی خاچ پەرستان، خەلیفەی فاتمیەکان کردی بە وەزیری

برازای[1] وناردنی بۆ میسر بە زووترین کات.[2]

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کەوا چۆن پارچەیەك لە قژی ئافرەتێکی موسڵمان، چەند کاریگەرو سوودی هەبوو، چەند بەڕێزو بەنرخ بوو لەلایەن ئەوانەی نرخی ڕاستەقینەی ئافرەتیان لابوو:

کاریگەری کردە سەر دڵ وهۆش وغیرەتی بەهێزترین وگەورەترین والی ئەو کاتی شام، سوپای هاوکاری نارد.

پاش مانەوەی صەلاح الدین لە میسر خەلیفەی فاتیمی نەخۆش کەوت و فەرمانڕەوایی میسری بەخشی بە صلاح الدین، لەبەر دەست پاکی وئازایەتی وتوانای بەرزی سەربازی وڕامیاری.

ئەو ڕووداوەش بووە هۆی گۆڕینی مێژوو وجوگرافیای ناوچەکە، چونکە دوای مردنی نورالدین شام ومیسر یەکیان گرتەوە.

دوای یەکگرتنەوەی ئەو دوو ولایەتە ئیسلامیە، توانیان سوپایەکی یەك پارچە پێکبهێنن وخاچ پەرستان لە هەموو شارەکانی شام ودوایی لە قودسی پیرۆزیش وەدەرنێن، پاشاکانی فەرەنساو ئەڵمانیاو ئینگلترا بە سەرشۆڕی بنێرنەوە وڵاتی خۆیان، پاش بەدیل گرتنی ژمارەیەکی زۆریان وئازاد کردنیان لەلایەن گەورەترین پاڵەوانی گۆڕەپانی شەڕو پاڵەوانی پیاوەتی وسەبرو ئارام وغیرەتی ئیسلامی.

---

خۆی تاوەکو مردنی لە ساڵی 564 کۆچی. لە دوای ئەو صەلاح الدینی برازای بووە وەزیر. الزركلي، الأعلام، 183/3.

نو الدين الزنكي: العادل نور الدين: لە ساڵی 511 کۆچی لە شاری حەلەب لە دایك بووە، دوای مردنی باوکی بووە والی حەلەب، زۆر دادپەروەر بووە، قوتابخانەی زۆری دروست کردووە، لە ساڵی 569 کۆچی وەفاتی کردووە. الزركـــلي، الأعلام، 130/7.

1 ــ صلاح الدين : يوسف بن نجم الدين الشادي: لە شاری تکریت لە دایك بووە، بووە یەکێك لە بەرزترین سەرکردەکانی سوپا لە شام، وەزارەتی وەرگرت لە میسر، دوای مردنی خەلیفە عاضد شام ومیسری کردە یەك وڵات، لە ساڵی 587ك- 1187ز قودسی پیرۆزی ڕزگار کرد. لە ساڵی 1193ز کۆچی دوایی کرد. الزركـــلي، الأعلام، 220/8.

2 ــ نور الدين عتر، ماذا عن المرأة، دمشق، دار الفكر، ط4، 1402هـــ/ 1981م، ص27.

# بەشی شەشەم

## دوو بابەتی گرنگی پەیوەست بە ئازادی ئافرەتانەوە

**باسی یەکەم: خۆداپۆشینی ئافرەت ( حجاب المرأة )**

**باسی دووەم: خوێندنی ئافرەت ( تعليم المرأة )**

## باسی یەکەم: خۆداپۆشینی ئافرەت (حجاب المرأة)

بابەتی یەکەم زۆر بەدرێژی باسمان کردووە لە کتێبی ( پیاوان و ژنان تەواوکاری نا یەکسان ) بۆیە تەنها باسی بابەتی دووەم دەکەین کە خوێندنی ئافرەتە.

خوای گەورە وبەزەیی، بەخشندەی خۆی بە مرۆڤایەتی بەخشی بە ناردنی پێغەمبەرێکی ڕاستگۆ، ناردنە خوارەوەی کتێبێکی بێ هاوتا پڕ لە زانستی سەردەم، لەلایەن هەردوو کتێبی مەسیحیەکان ویەهودیەکان ئاماژەی بۆ کراوەو بە ڕاست ودروستی ناوبراوە ولەوانیش بالاترە لە هەموو بوارەکدا. هەر ئەو کتێبەیە خەڵکان لە سەرلێشێواوی، نەزانی، دواکەوتوویی، بەندایەتی بۆ بەندەکانی تر، نەخوێندەواری دەردەهێنێ بۆ ڕۆناکی، زانست وزانیاری، دادوەری، ڕاستی، بەرزی. هەر ئەو کتێبەیە بەرنامەی مرۆڤایەتی یە، چونکە دەستووری ژیانە، زانستی سەردەمە، سەربەرزی دونیاو دواڕۆژە بۆ نێرو مێینە.

لە گرنگترین هۆکارەکانی فێربوون وخوێندن پێنووسە (القلـم)، هەر لەبەر بەرزی وڕێزی ئەو هۆکارەیە، هەرچەندە کە زۆر بچوکیشە خوای گەورە سوێندی بەو خواردووە، هەروەك فەرموویەتی: ﴿ نٓ ۚ وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ ﴾ القلم: 1.

لە ئایەتە سەرەتاکانی هاتنە خوارەوەی قورئان باسی خوێندنە، ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ﴾العلق: 1. خوای گەورە باسی پێنووس دەکات لەبەر گرنگی لە فێرکردن وبانگەوازکردنی خەڵک بۆ تێگەیشتن وپێگەیشتن، هەروەها فەرمانیشی داوە بە خوێندن وفێربوون بۆ هەردوو ڕەگەز بەبێ جیاوازی، بۆیە لەسەر باوکان پێویستە منداڵەکانیان فێری خوێندن بکەن– نێرینەو مێینە– تاوەکو شارەزای کاروباری دونیاو ئاین بن، ژیانی ڕۆژانەیان بە شێوەیەکی ڕێك بەڕیوە بچێت لە گشت بوارێکەوە.

هەروەها خوای گەورە لە ئایەتی تر ئاماژە بەوە دەکات کەوا ئەوەی خوێندەوارەو شت دەزانێ هەرگیز وەك ئەوە نیە کەوا خوێندەوار نیەو نازانێ، چونکە ئەوەی لەکارێك شارەزا بوو ئەوا زیاتر پێوەی پابەند دەبێت وبەرگری لێدەکات ولە پێناویدا هەموو

شتەكانی خۆی بەخت دەكات، بەڵام گەر زانیاری نەبوو نازانێ بۆچی كار دەكاو بەرگری لەچی دەكات. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُوا الْأَلْبَابِ ﴾الزمر: 9.

ئەوانەی خاوەن زانست وزانیارین، خوای گەورە بەرزتریان دەكات لەوانەی كەوا خاوەن زانیاری نین، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾ المجادلة: 11.

لەلایەكی ترەوە پێغەمبەری پێشەواﷺ فەرمانی كردووە بە موسڵمانان هەردوو رەگەز كەوا هەوڵی فێربوونی زانست بدەن، هەروەك لە ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەگێڕنەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺفەرموویەتی: ((طلب العلم فريضة على كل مسلم)).[1]

هەروەها پێغەمبەری پێشەوا ﷺ فێربوونی زانستی پەیوەست كردووە بە چوونە بەهەشتەوە، لە ئەبو هورەیرەوەﷺدەگێڕنەوە كە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: (( ومن سلك طريقاً يطلب فيه علماً سهل الله له به طريقاً إلى الجنة)).[2]

لە معاویەوە دەگێڕنەوەﷺ كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((من يُرِد الله به خيراً يفقهه في الدين)).[3]

لە ئەبو سەعیدی خودری[4] ﷺ دەگێڕنەوە، ڕۆژێك ئافرەتان هاتنە لای پێغەمبەری خواﷺ ، وتیان: پیاوان لە ئێمەیان بردۆتەوە، چونكە لای بەڕێزتانن وهەموو شتێك فێردەبن ئێمەش دوورین لە ئێوە، بۆیە دەمانەوێت ڕۆژێكمان بۆ دابنێیت بۆ فێربوون،

---

1 ـ الطبراني، المعجم الصغير، حديث: 22 ، ص28 وحديث: 61 ، ص42.
2 ـ مسلم: 48 ـ كتاب الذكر والدعاء والتوبة باب: 11 حديث: 38 ـ 2699. سنن أبي داود كتاب العلمباب : الحث على طلب العلم حديث : 3641(317/3).
3ـ البخاري 3 ـ كتاب العلم باب: 13 حديث: 17 ، 39/1.
4ـ أبو سعيد الخدري: سعد بن مالك بن ثعلبة الأنصاري الخزرجي: لە هاوەڵە زاناكان بووە، فەرموودەی زۆری گێڕاوەتەوە، ساڵی 74ك، كۆچی دوایی كردووە. ابن حجر، الإصابة، 35/2 الرقم: (3196). وابن كثير ، البداية والنهاية، 3/9.

پێغەمبەری خواش ڕۆژێکی بۆ دانان وئامۆژگاری زۆری کردن. ئەو فەرموودەیەش مانای ئەوەیە کەوا ئافرەتانی سەردەمی هەڵاتنی خۆری ئیسلام زۆر بە پەرۆش بوون بۆ فێربوون، بەربەرەکانی پیاوانیان دەکرد لە فێربوون و گوێگرتن لە ئامۆژگاری.[1]

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر هانی موسڵمانانی دەدا بۆ فێربوون هەتاوەکو وەسیەتی کرد کەوا بەندەو کەنیزەکانیش فێرە خوێندن بکەن. هەموو شارەزایەك لە مێژوو دەزانێ بەندەو کەنیزە کە هیچ مافێکی بوون وکەسایەتیان نەبوو نەوەك مافی خوێندن وفێربوون، کەواتە ئیسلام لە هەموو ئاینەکانی تر گرنگی بە خوێندن دەدات، نەك تەنها مافی ئافرەتی ئازاد وکەنیزەو بەندەش بە فێربوون و خوێندن دەدات، بەڵکو بە واجیبی دادەنێ لەسەر باوك ودایك و وەلی ئەمرەکان، ئەگەر کەمتەرخەمیان کرد ئەوا تاوانبارن.

لە ئەبی بەرەدەوە ﷺ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (( سێ کەس دوو پاداشتیان هەیە: پیاوێکی خاوەن کتێبی ئاسمانی باوەڕی بە پێغەمبەری خۆیان وبە موحەمەد ﷺ هێنا بێ، بەندەیەکە لای گەورەکەی کاردەکات مافی خواو مافی گەورەکەی دەدات، پیاوێکە کەنیزەیەکی لایەو فێری ڕەوشت وخوێندنی دەکات، پاشان ئازادی بکات وبە شووی بدات)) ((ثلاثة لهم أجران: رجل من أهل الكتاب آمن بنبيه وآمن بمحمد ﷺ والعبد المملوك الذي أدّى حق الله وحق مواليه، ورجل عنده أمـة يطوها، فأدبّها فأحسن تأديبها، وعلمها فأحسن تعليمها ، ثم أعتقها وزوّجها فله أجران)).[2]

لەسەردەمی هاتنە خوارەوەی قورئان ئافرەتان دەچوونە کۆڕی خوێندن وفێربوون، تاوەکو ژمارەیەکی زۆر لە ئافرەتانی زانا پەیدا بوون، لە زۆر شوێنان بوونە مامۆستای پیاوان. هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی عائیشەی ﵂ خێزانی دەڵێ: نیوەی ئاینتان لەو ئافرەتە سوورەیە وەربگرن.

---

1ـ البخاري: 3 ـ العلم باب: 35 حديث: 101، 50/1 مسلم 45 ـ كتاب البر والإحسان باب: 47 حديث 151 ـ 2632 ، 2554/5 .

2 ـ البخاري 3 ـ العلم باب: 31 حديث: 97 ، 48/1.

((خذوا نصف دينكم من هذه الحميراء)).[1] لە ئەبو موساى ئەشعەریەوە دەگێڕنەوە ﷺ كە دەڵێ: (( هەر بابەتێك ببوایە كێشە بۆمان پرسیارمان لە عائیشە دەكرد، ئەویش وەڵامی لابوو)) ((ما أشكل علينا أصحاب رسول الله ﷺ حديثاً قط فسألنا عائشة إلا وجدنا عندها من علم)).

هەروەها لەسەردەمی ئەمەوی عەباسی وعوسمانیەكانیش ژمارەیەكی زۆر ئافرەتی ناودار هەبوون لە هەموو نەتەوەكانی ناو خەلافەتی ئیسلامی بەبێ هەڵاوێردان كە گەیشتبوونە پلەیەكی زۆر بەرزی زانست وزانیاری، بۆ زیاتر زانیاری دەربارە ئافرەتە ناودارەكانی كورد بگەڕێنەوە بۆ كتێبی (المرأة الكردية ودورها في المجتمع الكردي– دانەر) هەروەها ئافرەتە ناودارەكان- المرأة في عالمي العربي والإسلامي- عمر رضا كحالة).

سەردەمانێكی زۆر تێپەڕی بەسەر خەلافەتی ئیسلامی ئافرەتان بەشداربوون لە زۆربەی ئەو چالاكیانەی كە بۆیان گونجاوە، بەتایبەتی فێربوونی زانست وزانیاری، هەر لەو كاتانەدا موسڵمانان خاوەنی هەموو شتێك بوون وسەروەری گشت نەتەوكۆمەڵگەكانی تر بوون، خەلكان لە شوێنی نزیك ودوور دەهاتن بۆ خوێندن وفێربوونی زانستە جیاكان لە زانكۆ وقوتابخانەكانی بەغداو قورطبة/ لە ئەندەلس وزانكۆی قەیرەوان لە تونس، دوایی لە ئەستەنبول وقاهیرە..هتد، بەلام كاتێ موسڵمانان پشتیان لە ئاین كرد بەشێوەیەكی گشتی وكەوتنە شوێن بێ باوەڕان، ئەوا كەوتنە دواوەی كاروانی شارستانیەت لە هەموو ڕوویەكەوە بەبێ هەڵاوێردان. لە عزەت و سەربەرزی وسەركردایەتی دابەزین بۆ زەلیلی وسەرشۆڕی ونەفامی ودواكەوتنی زانستی .

پاش ئەوەی موسڵمانان پشتیان لە ئاینی خۆیان كرد وكەوتنە شوێن بێ باوەڕان و فەرهەنگی ئەوانیان وەرگرت وخستیانە شوێن بەرنامەی خوا، ئەوا خۆیان و منداڵەكانیان وئافرەتانیان پشت گوێ خست ومافەكانیان پێشێل كرد وكەوتنە ناو بیری نەتەوەگەری وململانێ وبەبەرەكانی یەكتری، تاوەكو توانای یەكتریان لەناو بردو بێ

1 ــ الناصف، منصور علي، التاج الجامع للأصول، كتاب الفضائل، 382/3.

هێز بوون بەرامبەر بە دوژمن، ئینجا دوژمنان یەکەیەکە دەستیان کرد بە داگیر کردنیان، هەروەك بینیمان لە هاندانی شەریف حوسێن بۆ دژایەتی دەوڵەتی عوسمانی بەرامبەر سەربەخۆی وولاتە عەرەبەکان، بەلام لە جیاتی پێدانی سەربەخۆیی، بینیمان چۆن لەناوجەرگەی وولاتانی عەرەب وولاتیان بۆ جولەکە دامەزراند، هەموو خێرو بەروبومی وولاتانی عەرەبیشیان بۆ خزمەتی خۆیان بەکار دەهێنن تاوەکو ئێستا. هەروەها بەرامبەر بە کوردەکان خیانەتیان کرد ولە پەیمانی سیڤەر کە بەندی 62،61 باسی دەوڵەتی کوردی تیابوو، لە پەیمانی لۆزان ئەوەشیان بۆمان ڕەوا نەبینی ودابەشیان کرد بەسەر چوار پارچە کە تاوەکو ئەو ساتەی تیایدا دەژین هەر بەو دەردەوە دەناڵێنین.

بەم شێوەیە موسڵمانان مێژووی بەرزی خۆیان لە بیرکرد، بیریش ناکەنەوە جارێکی تر بۆی بگەڕێنەوە و دەستی پێوە بگرن تاوەکو سەربەزی وکەرامەتیان بگەڕێتەوە، لە جیاتی ئەوە زۆربەی پیاوەکان کەوتنە دوای نەتەوە گەریەتی، زۆربەی زانایانیش کەوتنە شوێن سەرکردەکان وبوونە داردەستەی نا هەق وناڕەوایی، کاریان ببووە هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی کتێبە فیقهیەکان بۆ گەڕان بە شوێن هەندێ فەتوای فیقهی تاوەکو ڕەزامەندی گەورەکانیان بەدەست بهێنن، بڕیارە ناڕەواکانیان بۆ بکەنە بڕیارێکی شەرعی وپاساوی ئاینیان بۆ بهێننەوە، لە جیاتی دانانی بەرنامەی درێژخایەن بۆ گێڕانەوەی کۆمەڵگە بۆ باوەشی ئیسلام وقورئان وسەربەرزی.

لەو واقیعە تاڵ وناخۆشەدا موسڵمانان نیوەی کۆمەڵگەیان بەتەواوی پشت گوێ خست، کە هاوبەش وهاوسەری پیاوە، دایکی نەوەکانی دواڕۆژە، پەروەردەکاری باڵەوانەکانی مەیدانە، بەم شێوەیە دوژمنان ئەو هەڵەیان قۆزتەوە، لەو دەروازەوە هاتنە ناو کۆمەڵگەکەمان، چونکە ئافرەت بێبەشکرا بوو لە خوێندن، لە ڕا وپرس پێکردن کاتی بە شوودانی، بێبەشکردن لە میرات، گەورە بە گچکە، ژن بە ژنی. لەبەرنامەی دوژمنان وایان داڕشتبوو لەبەرنامەکەیان کە ئەگەر بتوانن کۆنترۆلی نیوەی کۆمەڵگە بکەن کە ئافرەتە ئەوا زۆر بەئاسان کۆنترۆلی نیوەکەی تر دەکەن، چونکە چارەگێکی کۆمەڵگە منداڵە ئەویش پەروەردەی دەستی دایك کە ئەویش ئافرەتە.

دوژمنـان بـۆ بابـەتی خوێنـدنی ئـافرەت وپۆشـاکی ئـافرەت بـە شـێوەیەکی زۆر بەرنامەدار ولەسـەرخۆ هاتنـە نـاو کۆمەڵگـەی ئیسلامی، زۆربـەی ئەوانـەی خۆیـان بـە خاوەنی ئەو بەرنامە دادەنێن لە دەرچووانی زانکۆکانی ئەورپی بوون، یان ئەوانە بـوون کە گۆشکرابوون بە فەرهەنگی بیانی.

یەکـەم: لەسـەرەتاوە کـاتێ کـچەکان چـوونە قوتابخانـە، ڕێگەیانـدا بـە پۆشـاکی ئیسلامی بێت، نەوەك بە ڕووتی. ئەوەش لەبەر دوو هۆ بوو:

یەکەمیان: لەو سـەردەمانەدا بـاوکی کـچەکان بـە هـیچ شێوەیەك ڕێگـەیان نـەدەدا کچەکانیان لەو فەرمانە خواییـە دەربـچن، دووەمیـان: لەسـەرەتاوە بەڕێوەبـەرانی ئـەو قوتابخانانــە زۆر نــەرم بــوون تــاوەکو خــەڵکان کۆبکەنــەوە، دوایــی بــەهاوکاری دەسەلاتداران بەرنامەی تریان سـەپاند بەسـەر قوتابخانـەکان. ئـەو نـەرمی وشـلیە بۆ ئەوەبوو تاوەکو بەرنامەکەیان ئاشکرا نەبێ- واتە لابردنی گومـان لـە ئامانجـەکانیان- هـەروەها تـاوەکو بەرنامەکـەیان بـە هێواشـی بـڕات بـەڵام کاریگەریـەکی زۆر ئەکیـدی هەبێت.

مەلەك حافظ لە کتێبی (المرأة فـي ظـلال القـرآن) دەڵێ: چوونی کـچەکان بـۆ قوتابخانـە ولابردنـی سـەرپۆش وچـوون بـەدەم ڕووتـی وتێکەڵاویـەوە، بـە شـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ وخێـرا نـەبوو، بـەڵام زۆر درێـژ خایـەن بـوو، سـەرەتا ئافرەتـان دەچـوونە قوتابخانە بە پۆشاکی شـەرعی ونـەبوونی تێکـەڵاوی، دوای چـەند سـاڵێك بڕیـاردرا کـە تەنها سەرپۆشەکەیان لابدەن ودەم وچاویان دیـار بکـەوێ، پاشـان دیـار کـەوتنی قـژی سەر بەکەمی تاوەکو دیار کەوتنی هەموو قـژی سـەر، یـان دانـانی سەرپۆشـەکی تـەنك زۆربەی بۆ جوانی بوو نەوەك بـۆ خۆداپۆشـینی ئـاینی. لـە کۆتاییـدا کـچان دەچـوونە قوتابخانە هەموو سەرو مل وسنگیان لە دەرەوە بوو.

هەروەها دەربارەی پۆشاك بەهـەمان شـێوە، یەکـەمجار تـەنها قاچیـان دەرکـەوت، دوایی هەموو لاقی دەرکـەوێت تـاوەکو چۆکی، تـاوەکو گەیشـتە سـەرووی چۆك، یـان گۆڕینی بۆ پۆشاکی پیاوان. تاوەکو وای لێهات ئافرەتان لەهەموو بوارەکان چاولێکەری پیاوان بکەن.

لەسەرەتا خاوەن دەسەلآت وخاوەن بەرژەوەندی وخاوەن سامانەکان بەشداری ئەو بەرنامەیان کرد، دوایی گەیشتە هەموو چینەکانی کۆمەڵگە بەناچاری.

دووەم: پاش ئەوەی قۆناغی یەکەم سەرکەوت لەبەرنامەی بێگانەکان، ژمارەیەکی زۆر ئافرەت وکچیان ڕاوکرد، تاوەکو وایان لێهات دژایەتی هەموو داب ونەریتی دایك وداپیریان بکەن. قۆناغی دووەم بریتی بوو لە گۆڕینی پەیڕەوو پرۆگرامی قوتابخانەکان، کە زۆر بەئاسانی ئەوەشیان بۆ چووە سەر چونکە ئەگەر سەرکەون لە قۆناغی یەکەم کە زۆر گرنگتر بوو لە قۆناغی دووەم، چونکە پۆشاك لە قورئان زۆر ئایاتی لەسەر هاتووە.

لەسەرەتای دامەزراندنی ئەو قوتابخانانە، پرۆگرامیان بریتی بوو لە خوێندنی هەندێ بابەت کە پەیوەست بوو بە ئافرەتان، زانستی سروشتی، مێژوو، جوگرافیا. بە هیچ شێوەیەك بەلای ئیسلامدا نەچوون، تاوەکو دەستی خۆیان بینی ئینجا هێرشەکانیان دەستی پێکرد، سەرەتا بە هێرش بردنە سەر زانایانی ئیسلامی ناودار، فەقیهی مەزهەبەکان، تاوەکو گەیشتنە هێرش کردنە سەر پێغەمبەرﷺ خێزانەکانی، جێنشینەکانی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ. ئەو سەرکەوتنانە زۆربەی بە هۆی پاڵپشتی فەرمانڕەواکان بوو، یان بەهۆی ترس وتۆقاندن.

ووتەی یەکێك لە سەرکردەی ئافرەتانی میسر (أمينه كچی السعيد): چۆن مل کەچ بکەین بۆ ئەو چوار فەقیهەیە کە لە سەدەی تاریکی لەدایك بوون، ئیمەش پەیمانی ئیشتیراکی عەبدولناصرمان هەیە.

قاسم ئەمین دەڵێ: گەیشتە کەسایەتی تەواوی مرۆڤ هەرگیز لە سەدەکانی ڕابووردوودا نیە، بەڵکو پێویستە بگەڕێن بە دوای ئەو کەسایەتیە تەواوە لە داهاتووەکی دوور.

موحەمەد قوتب دەڵێ: قوتابخانەکان ژمارەیەکی زۆر لە مامۆستایان پێگەیاند کە بۆ ماوەیەکی درێژ لە خزمەتی بێگانە بوون، بە دوور خستنەوەی قوتابیان لە ئاین ورەوشتی ڕەسەن.

لەو سەردەمانە هەریەکێك لەو کولێژانە ژمارەیەك لە قوتابیان دەرچواند بۆ خزمەتی خۆیان، وەك: کۆلێژی ئاداب بۆ دانانی بیرو بۆچوونی نامۆ، کۆلیژی یاسا بۆ دانانی ژمارەیەك لە بڕیارو یاسا کە دژایەتی تەواوی هەبێ بە ئیسلام ویاساکانی، کولێژی ڕامیاری بۆ دەرچوونی پیاوی ڕامیاری گۆشکراو بە بەرنامەی خۆیان تاوەکو کاتی گەیشتنە پلەی سەرۆك لە ژێر کاریگەری ئەوان بێت، هەروەها دەرچوونی ژمارەیەك لە ئافرەتانی دوور لە هەموو داب ونەریتێکی کۆمەڵایەتی وئاینی بە هۆی گۆشکردنیان بە بیردۆزەکانی فرۆیدو داروین وسارتەر.[1] چونکە ئەو بیردۆزانە دەیانەوێت مرۆڤایەتی بگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمانەی وەك ئاژەل دەژیان، کە ناویان ناوە (مافی دایکایەتی–الحق الأمي)، هەروەك کارل مارکس دەڵێ: لەبارچوونی هەقی دایکایەتی، شکستەکی مێژوویی جیهانی بوو، بۆ ڕەگەزی ئافرەت، لەو کاتەی سالاری ماڵ وپێشەوایەتی لە ئافرەت وەرگیراوە، ئەو پلەوپایە بەرزەی لە دەستدا، بوو بە بەندەی پیاو وئارەزووەکانی، بەندی کرد وکردیە هۆکارێك بۆ هێنانە بەرهەمی منداڵ.

بۆ زانینی مانای مافی دایکایەتی دەگەڕێینەوە کتێبی دکتۆر زهیر الحطب دەربارەی مافی دایکایەتی دەڵێ: پێشتر خواردنی هۆزە سەرەتاییەکان بەند بوو لەسەر ڕاوکردن،

---

1 ــ سیغموند فروید:(1856-1939)، پزیشکەکی نەمساویە، زانای دەروونناسی بوو، لێکۆڵینەوەی کردووە لەسەر کاریگەری جینسی لەسەر قۆناغی منداڵی، لە کتێبەکانی(تەفسیری خەونەکان)، (سێ لێکۆڵینەوە لەسەر جینس). المنجد في الأعلام، ص413.

تشارلز داروین:(1809-1882)، زانایەکی سروشتی ئینگیزیە، خاوەنی بیردۆزی پەرەسەندن لە زیندەوەران. المنجد في الأعلام، ص238.

جان بۆل سارتر:(1905-1980): فەیلەسوف ونووسەرو ڕەخنەگری فەرەنسی، لە پاریس لە دایك بووە، یەکێکە لە وجودیە ڕەشبینەکان، لە گوتەکانی: ئادەمیزاد بەگشتی خۆی ئازادی هەڵسوکەوت ودیاری کردنی کارەکانی هەیە، بیردۆزی کارل مارکس کاریگەری زۆری لەسەر هەبوو. چیرۆك وشانۆوی زۆری هەیە لەوانە: (بوون ونەبوون، ڕێگەی ئازادی، دەستە پیسەکان، دیوار)، لە ساڵی 1964 خەلاتی نۆبلی پێبەخشرا، بەلام وەری نەگرت. للمنجد في الأعلام، ص285.

کارل مارکس:(1818-1883)، فەیلەسوفەکی کۆمەلایەتی ئەلمانیە، بەیاننامەی شیوعی دەرکرد بەهاوکاری لەگەڵ ئەنجلس، لە کتێبەکانی (سەرمایە)کە دەستووری مارکسی وڕێسای کۆمۆنیزمی یە. المنجد في الأعلام، ص511.

هەڵگرتنەوەی بەرووبوومی درەختەکان، بەو دوو هۆکارەش نەیان دەتوانی خۆراکی منداڵەکان بە گشتی پەیدا بکەن، دەستیان کرد بە کوشتنی کچەکان، بەمەش ژمارەی ئافرەتان زۆر کەم بوونەوە لەناو هۆزەکان، تاوەکو وای لێهات یەک ئافرەت لەناو هۆزێك بۆ هەموو پیاوەکان بێت، واتە فرە پیاوی بۆ یەك ئافرەت، ژمارەی منداڵەکانی ناو هۆزەکانیش پەیوەست بوو بە توانای ئافرەتەکە لەسەر منداڵبوون، هەروەها ناسینەوەی باوکی منداڵەکە تەنها ئافرەتەکە دەیزانی ئەو منداڵە کێ باوکیەتی، چونکە تەنها خۆی دەیزانی لەگەڵ چەند کەس جووت بووە، لە کاتی پاکی بووە یان بێ نوێژی، سکی پڕ بووە لەو کات یان نا، واتە ئافرەتەکە بووە بەخاوەن بڕیار لەناو هۆزەکە بەهۆی زانینی باوکی ئەو منداڵانەی کە لەو لەدایك دەبن، بەو هۆیەوە دەسەڵاتی زۆری هەبوو لە هۆزەکەیان. ئەو کردارە ناونرا مافی دایکایەتی.[1]

کازیوە صالح دەڵێ: کاتی زێڕینی ئافرەت ئەو کاتە بووە کەوا ئافرەت وەك خوا دەپەرسترا، وەك: سەردەمی (الآلهة عشتار) وخوای چاندن وگەشە(حاتور وئینریس– آلهة البذر والنماء ). ئەو خاتوونە وەك گەورەکەی کارل مارکس دەیەوێت بگەڕێنەوە بۆ سەردەمی مافی دایکایەتی وپەرستنی ئافرەت لە جیاتی خوای خولقێنەری ئافرەت و پیاو.[2]

لێرەوە دەمەوێت وەستانێك بکەین لەسەر ئەو خاڵەی باسمان کرد دەربارەی مافی دایکایەتی:

❖ لە ڕوانگەی پزیشکیەوە، هەر ئافرەتێك ناتوانێ لە یەك ساڵ لەیەك منداڵ زیاتری ببێ هەرچەندە ئەگەر جووت بوون بکات لەگەڵ هەزار پیاودا، چونکە کاتێ پیتێن ڕوویداو کۆرپەلە دروست بوو، ئەوا کرداری هێلکە دروست بوون دەوەستێ، کەواتە تەنها سپێرمی یەك پیاو پیتێن دەکات ئەوانی تر بێ سوودن وتەنها بۆ تێرکردنی ئارەزووەکانە.

---

1 ــ زهير حطب، علم اجتماع الأسرة، ص16.

2 ــ كازيوة صالح، المرأة الكردية في الألفية الثـالثة ، ص 1.

❖ کەواتە لەو هۆزە هەر ساڵێ لەیەك منداڵی زیاتر نابێ، لەوانەیە کەمتریش، چونکە لەو کات ئافرەت خۆی شیری بە کۆرپەکەی دەدا، شیر پێدانیش هۆیەکە بۆ رێگە گرتن لە منداڵبوون، ئەوا بەم شێوەیە منداڵبوون ماوەیەکی زۆر زیاتر دوور دەکەوێتەوە، واتە لەوانەیە دوو ساڵ جارێك ئەو ئافرەتە یەك منداڵی دەبوو، لەماوەی یەك سەدە لەو هۆزە تەنها 50 کەس زیادی دەکرد، لەوانەیە لەو سەدەیە زیاتر لە 50 کەسی پیرو گەنج بەهۆی مردن یان نەخۆشی یان شەڕو کوشتار لەناودەچوون. لەو ئەنجامە بۆمان دەردەکەوێ کەوا ئەو هۆزە دوای چەند ساڵێکی کەم لەناو دەچێت، بە هۆی کەمی لەدایکبوون. ئەوە بێجگە لە ئەگەری مردی منداڵەکە بەهۆی نەخۆشی، کەمی خواردن، کەمی خزمەتی منداڵ لەلایەن دایکی، چونکە ئەو دایکە هەر دەتوانێ خەریك بێت بە تێرکردنی ئارەزووی سەدەها پیاوی هۆزەکەی. ئێمەش دەپرسین ئێوە ئەی پێشکەوتوو خوازان، ئایا دەتانەوێ کۆمەڵگە بەرەو نەمان وکەم بوونەوە وقڕبوون بڕوات یان بەرەو پێشەوە بڕوات وگەشە بکات؟

❖ گواستنەوەی نەخۆشی زۆربەی بەهۆی ئەو فرە مێردیەوەیە، چونکە لە رۆژئاوا هەر ئافرەتێك چەند دۆستی هەیە بۆ جووتبوونی نا شەرعی، بوونی ئەو دۆستانە وادەکات ئەگەری تووش بوونی ئافرەتەکە ودۆستەکانی بە نەخۆشیە زاییندەکانی زۆر بکات (وەك ئایدزو هەوکردنی ڤایرۆسی جگەر)، ئەی ئەو ئافرەتەی سەد مێردی هەبێ دەبێ باری تەندروستی بۆ کوێ سەرهەڵدات؟ ئەی پێشکەوتووخوازان ئایا دەتانەوێ کۆمەڵگە لەناو نەخۆشیەکان بتلێتەوە، یان دەتانەوێت لە خۆشی وتەندروستی چاکدا بژیت؟ هەروەك بەڕێزتان دەزانن ئەو نەخۆشیانەی بەهۆی بەدڕەوشتی سەدەی بیست و یەکەم دەگوازرێتەوەو بڵاو دەبێتەوە لەگەڵ ئەو هەموو پێشکەوتنە زانستیە چارەسەری بۆ نەدۆزراوەتەوە. ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە ئەو نەخۆشیانە بڵاودەبنەوە بە هۆی بچوکترین بوونەوەری سەر زەوی کە ڤایرۆسەکانە.

❖ ئێوەی بەڕێز، بە موسڵمانان دەڵێن کۆنەپەرست، چونکە ئاینەکەیان تەمەنی 1430 ساڵە ، ئەو ئاینەی خاوەنی بەرنامەو کتێبێکی پیرۆزی نەگۆردراوە، هاوشانە لەگەڵ زانست، هەموو زاناو زانستەکانی جیهان سەری بۆ شۆڕدەکەن لەگەڵ هەربۆزینەوەیەکی زانستی نوێ، چونکە پاش ئەو دۆزینەوانە دەبینن قورئان لە پێش ئەوانە باسی ئەو بابەتەی کردووە. ئەی بەڕێزان چی بەو کەسانە دەڵێن کە خۆیان بە ڕۆشنبیرو خاوەن بیروباوەڕی پێشکەوتوو دادەنێن، لە هەمان کاتدا باسی بابەتی (مافی دایکایەتی) دەکەن کە هەزارەها ساڵ لە پێش ئیسلامەوە ڕوویداوە لەناو یەکێك لە هۆزەکان. ئایا ئەوە کۆنە پەرستیە یان ئاینی ئیسلام؟ ئایا دەتانەوێت کۆمەڵگە بگەڕیننەوە سەر ئەو بابەتەو خەڵکان پیادەی بکەن لە ژیانیاندا، تەنها بەهۆی بوونی بەڵگەیەکی لاوازی مێژوویی، لەناو تەنها چەند هۆزێك ڕوویداوە، لەوانە تەنها لەیەك ناوچەش بێت.

❖ ئەو بەڵگەیەی کە هێناوتانە دەربارەی فرە مێردی هیچ بەڵگەیەکی زانستیان نیە، چونکە لە هیچ کتێبێکی باوەڕ پێکراو نەهاتووە وەك تەورات، ئینجیل، قورئان، لەوانەیە شتێکی خەیاڵاوی بێت، یان لەوانەیە لە دانانی فەیلەسوفە مولحدەکانی یۆنانی بێت.

❖ زۆرم پێ سەیرە کاتێ باسی بابەتی (مافی دایکایەتی) دەکەن، بەبەرزترین لوتکەی ماف وئازادی ئافرەت دادەنێن. ئێمەش دەپرسین ئەو ئافرەتەی کەوا بەلای کەمی لە خزمەتی جینسی100 کەسدا بێت، ئایا چۆن دەتوانێت لە ژیان ئاسوودە بێت و ئیستراحەت بکات؟ ئەگەر وا گریمان بکەین لەو سەد پیاوە پەنجا پیاو ڕۆژانە ئارەزووی جینسی هەبێ بۆ ڕابواردن وجووتبوون، ڕۆژ خۆی 24 کاتژمێرە، کەواتە ئەو ئافرەتە بەلای کەمی هەر یەك کاتژمێر دووجار جووت بوون دەکات. ئایا ئەو ئافرەتە هیچ کاری تری نیە جگە لە تێرکردنی ئارەزووەکان؟ ئایا ئەو ئافرەتە ڕۆژانە پێویستی بەخواردن نیە؟ ئایا پێویستی بە خەو نیە؟ ئایا ئیستراحەتی ناوێت؟ ئایا ئەو جۆرە ماندوو بوونە لوتکەی ئازادی ومافی ئافرەتە؟ یان کوشتن وسووکایەتی بە ئافرەتە؟

ئایا بەو جۆرە ژیانە ئافرەت دەبێتە سالاری ماڵ وکۆمەڵگە یان دەبێتە خزمەتکارێکی ماندوو وشەکەت بۆ تێرکردنی ئارەزووەکانی سەد پیاو؟ ئێوە پێتان ڕەوا نیە پیاو دووژن بهێنێ چونکە لای ئێوە سووکایەتیە بە ئافرەت وپێشێلکردنی ماف وئازادیەکەیەتی، هەرچەندە لەوانەیە ژنی دووەم هاوکاری ژنی یەکەم بکات لەکاری ماڵ ومنداڵ وبگرە لە ئەرکی تێرکردنی ئارەزووی جینسی، لەلایەکی تر پێتان ڕەوایە کەوا ئافرەتێك بەتەنها شەو وڕۆژ لە خزمەتی 100 کەسی ئارەزوو جیاوازدا بێت. ئەوە بەلای من بەرزترین پلەی بەندایەتی ئافرەتە، کە زۆر دواکەوتووترە لەو بەندایەتیەی کە بیستوومانە لە هەموو سەردەمەکانی تری جاهیلی کۆن ونوێدا.

❖ هەروەك بەڕێزتان ئاگارن لە زانستی دەروونناسی، کەوا هەموو کەسێك– پیاو یان ئافرەت– خۆشەویستی مولکایەتی هەیە (حب التملك)، واتە هەموو پیاوێك کاتێ دڵی ئافرەتێك دەگرێت، حەز دەکات ئەو ئافرەتە بێتە مولکی ئەو، تەنها بۆ ئەو بێت و مافی کەسی تری بەسەرەوە نەبێ، ئافرەتیش بەهەمان شێوە، حەز ناکات کەسی تر هاوسەرەکەی لەو داگیر بکات بەیەکجاری. جا لێرەوە مەبەستم ئەو ئافرەتە داماوەیە کاتێ بەردەوام 100 کەس دەچێتە لای، ئەو ئافرەتە لەو سەد کەسە تەنها دڵی بۆ یەکیان یان دووان دەچوو، بەلام لە دڵ وئارەزوودا قینی لەوانی تر بوو، کەواتە بەگوێرەی بیردۆزی (مافی دایکایەتی) ئەو ئافرەتە دەبێ جووت بوون بکات لەگەڵ ئەوانی تر، هەرچەندە خۆی ئارەزووی بۆیان ناچێت وقینی لەو کەسانەیە، ئایا ئەوە پێشێل کردنی مافی ئەو ئافرەتە نیە کەوا بەزۆری زۆردار ئارەزووبازی لەگەڵدا بکرێت. ئایا ئەو جۆرە مافەیە ناوتان لێناوە خوایەتی ئافرەت؟ وەك: خوای عیشتار وخوای چاندن وگەشە؟ بەلام ئێمە بیستوومانە کەوا خوای نەفامەکان خزمەت دەکرا، بەلام خوای نوێی ئێوە لە خزمەتی 100 پیاودایە شەوڕۆژ.

❖ نازانم ئەو جۆرە مافە چ ناوێکی بۆ بدۆزینەوە، مەگەر تەنها ناوی بنێین چەواشە کردنی خەڵك، یان دژایەتی هەموو مرۆڤایەتی وئاین وڕەوشت وداب ونەریت، یان جێبەجێ کردنی پرۆتوکۆڵەکان بەپێی بەرنامەی داڕێژراو. لە پرۆتۆکولی حەڤدەمدا

دەڵێت: ئێستا نزیك بووین لەو کاتەی کەوا ئاینی مەسیحی چۆك بدات وبڕوخێ وبڕمێ بەتەولوی بەرامبەر بەرنامەکانمان، لەوانەیە ئەو ئەنجامە چەند ساڵی تری نەخایەنێ. دەربارەی ئاینەکانی تر دەڵێ: خەریکە ئەوانیش پاشەکشە دەکەن، بەبەراورد لەگەڵ سەرکەوتنەکانیان لە سەدەکانی پێشوو.[1]

ڕۆژهەلاتنـــاس (جب) بەدڵخۆشیەوە دەڵێ:( قوتابخانـەکانی کـچان بیلبیلـەی چـاومانە). ئـەو ڕسـتەیە تـەنها ئـەو واتایـە دەبەخـشێ کـەوا هـاتنی ئـەوان بـۆ کۆمـــــــەڵگەی ئیـســــــلامی و کردنـەوەی قوتابخانـەکانی ئـەوکات بـێ ئامـانج و نەبووە، بەڵکو لەپشت پەردەوە شتێکی تر هەبووە.

لە یەکێك لە پرۆتۆکوڵەکاندا هاتووە، کە دەربارەی خویندن وپەروشت: بۆ جێبەجێ کردنی بنەماکانی بەرنامەکەمان وگواستنەوەی ئەو بنەمایانە بۆ ناو ئـەو گەلـەی کـاری لەسەر دەکەین، پێویستە زۆر بە وردی مامەلە لەگەڵ خووپەوشتی ئەو گەلـە بکرێـت، ئەوا دەتوانین بەرنامەی خوێندنی ئەو گەلە بۆ بەرژەوەندی خۆمان سازبدەین. بەمەش ناگاتە دە ساڵ دەبینین ڕەوشتی کۆمەلایەتی ئەو گەلە زۆر گۆڕاوە، هەرچەندە ئەگەر ئەو گەلـە زۆر سەرسـەخت وبەرگریکـەر بن، لـە کۆتایـدا گـەلێکی تـر بـۆ ژمـارەی ئـەو گەلانەی تر زیاد دەکەین کە لە ژێر دەسەلاتی خۆمانن.

دەربارەی زانکۆکان وچۆنیەتی خوێندن لە پرۆتۆکولی شانزەهەمدا هاتووە: تاوەکو بتوانین هەموو ئەو هێزانە لەناو ببەین، ئـەو هێزانـەی کـە هـەوڵ دەدەن بـیری گونجـاو بڵاویکەنەوەو هاوکاری وپاڵپشتی کۆمەلایـەتی خـەڵك دەکـەن، سـەرەتا ئەمـەش دێتـە ئەنجام بە هەڵوەشاندنەوەی بازنـەی یەکـەمی ئـەو هێـزە ئـەویش زانکۆکانـە. باشـترین ڕێگـەش بـۆ ئـەو هەڵوەشـاندنەوە بریتیـە لـە گـۆڕینی پرۆگـرام وبەرنامـەی خوێنـدن، بـەرگری کـردن لـــە پێـشکەوتن ونوێکـاری خوێنـــدن، هەوڵـدان بـۆ بـەکارهێنانی مامۆسـتاکانی زانکـۆ و فەرمانبـەران بـۆ پـەیرەوکردنی بەرنامـەکانی خۆمـان بـەپێی نەخشەیەکی نهێنی دارێژراو، بەشێوەیەك کەسیان نەتوانی بەموو لێیان لابدات.

1 ــ عجاج نويهض، بروتوكولات حكماء صهيون، 262/2 .

### سێیەم: ڕای هەندێ لە زانایان دەربارەی خوێندنی ئافرەت

دەبینین وڵاتانی بەناو ئیسلامی کە بە شوێن پێی بێ باوەڕان کەتوون لە هەموو شتێکدا تەنها لە پێشکەوتنی زانستیدا نەبێ، هەروەك پێغەمبەری خواﷺ دەفەرمووێ: ((شوێنکەوتەی ئەوانەی پێش خۆتان دەبن، بست بەبست، باڵ بەباڵ، تاوەکو ئەگەر چوونە ناو کونی جورج مشك، ئێوەش تیایدا دەچن. گوتمان ئەی پێغەمبەری خواﷺ مەبەستت فەلەو جولەکەیە؟ فەرمووی: ئەی کەسی تر هەیە)). ئەبو سەعیدی خودری ﷺ گێڕاویەتیەوە. ((لَتتبعنَّ سُنَنَ الذين من قبلكم، شبراً شبراً وذراعاً بذراع، حتى ولو دخلوا في جحر ضَبٍّ لاتبعتموهم)). قلنا يا رسول الله، اليهود والنصارى؟ قال: ((فمن)). پاش ئەو هەموو شوێن کەوتن وچاولێکەریەی وڵاتانی ئیسلامی کردیان بۆ بەرنامەو فەرهەنگی ڕۆژئاوا، ئایا گەیشتن بە هەمان ئاستی زانستی وتەکنۆلۆژی کە ئەوان پێی گەیشتوون؟ نەخێر، پێنەگەیشتوون وپێشناگەن بەهەمان ئاست، چونکە تەنها تەکنۆلوژی شتەخراپەکانیان پێشکەش کردوون، لە جیاتی زانست وزانیاری. نازانم ئەی ئەو هەموو پاڕانەوەو شوێنکەوتنەیان لەچی؟

هەرچەندە زۆربەی زانایانی ڕۆژئاوا ئاماژە بەوە دەکەن کەوا قورئان پێشکەوتووترین کتێبی زانستە جۆراو جۆرەکانە، بەڵام بەداخەوە سەرکردەکانی وڵاتانی ئیسلامی ڕۆژێك بیریان لەوە نەکردۆتەوە کەوا بگەڕێنەوە سەر ئاینی خۆیان، تاوەکو ئەو مێژووە سەربەرزو پێشکەوتووەی پێشینان دووبارە بکەنەوە.

نووسەری ئیرلەندی برنادشۆ[1] دەڵێ: ئاینی محەمەدﷺ جێگەی ڕێزە، چونکە زیندووەو سەرسوڕهێنەرە، تاکە ئاینە کە لەگەڵ هەموو کات وشوێنێك گونجاوە، بۆیە دەبینم کەوا موحەمەد ﷺ ڕزگارکەری مرۆڤایەتی یە. ئەگەر پیاوێکی وەك ئەو سەرکردەی وڵاتانی جیهانی سێیەم بکات ئەوا هەموو کێشەکانیان چارەسەر دەکات.[2]

---

1ــ ملك حافظ، المرأة في ظلال القرآن، ص34.

2 ــ جۆرج. برنادشو: (1856-1950) چیرۆك نووسێکی ئیرلەندیە، لە شاری (دبلن)ی پایتەخت لە دایك بووە، بیری کارل مارکس کاری تێکردووە، ناسابوو بە گاڵتەبازی ورەشبینی. لە کتێبەکانی: پیاوی قەدەر، قوتابی شەیتان، خەڵاتی نۆبلی وەرگرتووە لە ساڵی 1925ز. المنجد في الأعلام، ص 337.

پرۆفیسۆر ئەلیکسیس کاریل دەربارەی خوێندنی کچەکانی قوتابخانە دەڵێ:[1] یاسا وبەرنامەی قوتابخانەکان بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەستە بە ئافرەتان، هاوسەرێتی وتەلاق، پێویستە زیاتر ڕەچاوی بەرژەوەندی منداڵەکان ونەوەکان بکات، هەروەها پێویستە ئافرەتان زانست وزانیاریەکی تایبەتی فێر بکرێن، ئەوەش تەنها بۆ ئەوە نیە ببنە پزیشك وئەندازیار وپارێزەر، بەڵکو تاوەکو بتوانن منداڵەکانیان زۆر بەجوانی پەروەردە بکەن وببنە تاکێکی بە سوود لە کۆمەڵگا.[2]

دووبارە گرنگی بە پەروەردەی منداڵ دەدات ودەڵێ: زۆرم پێ سەیرە کەوا بەرنامەی خوێندنی ئافرەتان هیچ بابەتێکی وای تیا نیە پەیوەست بێت بە لێکۆڵینەوە لەسەر سیفەتە فسیۆلوژی ودەروونیەکانی منداڵ و گەنجەکان. پێویستە ئافرەتان بگەڕێننەوە بۆ کاری سروستی خۆیان، کە تەنها کار کردن نیە، بەڵکو پەروەردەو چاودێری منداڵەکانە.[3]

ئێمە وەك موسڵمان خۆمان بە خاوەنی خوێندن وفێربوونی زانست دادەنێین، چونکە خوای گەورە و پێغەمبەرمان فەرمانی پێکردووین، پێویستمان بە تەوصیەی خەڵکی تر ناکات، بەڵام نابێت ئەو خوێندنە بێتە هۆی لە دەستدانی بنەماکانی تری ئیسلام لە بواری لە پۆشاك وڕەوشت و داب ونەریت وکلتورو فەرهەنگمان، چونکە وەرگرتنی شتێك و لەدەستدانی شتێکی تری گرنگ واتای ناتێگەیشتن ودووریە لە واقیع وخەسارەتمەندیە.

لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵەی درا لەو دوو سەدەی دوایی بۆ شێواندنی کۆمەڵگەکەی ئیسلامی وفریودانی ئافرەتان وپابەندبوونیان بە فەرهەنگی بێگانە، دەبینین موسڵمانەکان بە هەردوو ڕەگەزەوە لە پێشەنگی دەرچووانی زۆر لە قوتابخانەو

---

1 ـ ألكسيس كاريل، الإنسان ذلك المجهول، ص230.

2 ـ ألكسيس كاريل: (1873 ـ 1944): نەشتەرگەرێك وزانای فسیۆلۆژی فەرەنسیە، یەکەم کەس بوو چاندنی شانەکانی داهێنا، جائیزەی نۆبلی وەرگرتووە لە ساڵی 1912ز.
المنجد في الأعلام ، ص450.

3 ـ المصدر نفسه ، ص239.

زانکۆکانن، لە خەڵکانی تر زیاتر هەست بە لێپرسراویەتی دەکەن ولە خەڵکانی تر زۆر زیاتر خزمەت دەکەن لە فەرمانگەکان، دەست گرتنیان بە بەرنامەی ئیسلام هەردەم هاندەر بووە بۆ زیاتر فێربوون و چوونە پێشەوە، هەرگیز بەربەست نەبووە لەبەر پێشکەوتنی زانستی هەروەك ناحەزان بانگەشەی بۆ دەکەن.

خوای گەورە دەفەرمووێ: ئەگەر باوەڕتان پتەو بێ ولەخوا ترس بن، ئەوا فێڵ وتەلەکەبازی دوژمنان زیانتان پێ ناگەیەنێ: ﴿إِن تَمْسَسْكُمْ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ وَإِن تُصِبْكُمْ سَيِّئَةٌ يَفْرَحُوا۟ بِهَا ۖ وَإِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ لَا يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْـًٔا ۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ﴾آل عمران:120.

لەکۆتایدا داواکارم سوودمەند بن لەو بابەتە مێژووییەی ، کە بۆم باسکردوون، خوای گەورەش لەتەرازووی خێر بۆمان بنوسێ.

وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين

# سەرچاوەکان


1. القرآن الكريم
2. ابن حجر العسقلاني، شهاب الدين احمد بن علي، ت (852هـ): الإصابة في تمييز الصحابة معه الإستعاب في أسماء الصحاب.القرطبي، ت (463هـ): بيروت، دار الكتاب العربي، 4أجزاء، د.ت. وطبعة القاهرة 1907، 8 أجزاء .
3. ابن حزم الظاهري، أبومحمد، علي بن أحمد ت ( 456هـ ): الفِصَلْ في الملل والأهواء والنحل ، تحقيق (محمد إبراهيم نصر وعبد الرحمن عميرة). الرياض ، مكتبة عكاظ مجزءان ، 1402هـ/1982م.
4. ابن العابدين، محمد أمين بن عمر الدمشقي الحنفي ت:1252هـ، حاشية رد المحتار على الدر المختار شرح تنوير الأبصار بمصر، مطبعة مصطفى البابي،12 مجلداً، ط2 ،1386هـ/1966م.
5. ابن كثير، أبو الفداء، إسماعيل بن عمر، ت (774هـ): تفسير القرآن العظيم، تحقيق (محمد إبراهيم البنا). مؤسسة علوم القرآن، المنار للنشر والتوزيع، 8 مجلدات، 1419هـ/ 1998م.
6. ابن كثير، أبو الفداء، إسماعيل بن عمر ت (774هـ): البداية والنهاية، بيروت، مكتبة المعارف، ط6، 8أجزاء ، 1405هـ/ 1985م.
7. ابن منظور، أبي الفضل، محمد بن مكرم ت (711هـ): لسان العرب، تنسيق (علي شيري)بيروت، دار صادر، 18 مجلداً، 1408هـ/ 1988م.
8. أبو خليل، شوقي، الإسلام في قفص الاتهام ، دمشق ، دار الفكر ، ط5، 1402هـ/ 1982م.
9. أبو خليل، شوقي ، تحرير المرأة ممن؟ وفيم حريتها؟ بيروت- دار الفكر المعاصر، دار الفكر، 1998م، ، دمشق ، دار الفكر ، ط5، 1402هـ/ 1982م.
10. أبو داود، سليمان بن الأشعث ت (275هـ): سنن أبي داود، مراجعة وتعليق (محمد محي الدين عبد المجيد) د.م، دار إحياء السنة النبوية، 4 مجلدات، د.ت.

11. أحمد بن حنبل ت:241هـ، مسند الإمام أحمد، مراجعة: صدقي جميل العطار، بيروت، دار الفكر، ط2، 1414هـ/1994م.
12. أرثر كريستنسن، إيران في عهد الساسانيين، بيروت، دار النهضة، د.ت، ترجمه من الفرنسية يحيى الخشاب ومراجعة عبد الوهاب عزام.
13. ألكسيس كاريل، الإنسان ذلك المجهول.بيروت، مكتبة المعارف، د.ت، (ترجمة شفيق أسعد فريد).
14. ابن النديم، الفهرست، تحقيق (شعبان خليفة ووليد محمد العوزة).القاهرة، دار العربي للنشر،2 مجلد، 1991م.
15. والبار، محمد علي، أعمال المرأة في الميزان، جدة، الدار السعودية، 1404هـ.
16. البخاري ، محمد بن إسماعيل ت (256 ه): صحيح البخاري ، تحقيق (مصطفى ديب البغا). بيروت، مؤسسة الخدمات الطباعية، 6 أجزاء، 1401هـ/ 1981م.
17. البستي، ابن حبان محمد بن حبان بن أحمد التميمي ت:354هـ صحيح ابن حبان، تحقيق: شعيب أرناؤوط، بيروت، دار الرسالة، 18 جزء، ط2 ، 1414هـ/1993م.
18. البيهقي، أبو بكر، أحمد بن الحسين ت: 458هـ، سنن البيهقي الكبرى، تحقيق: محمد عبد القادر عطا، مكة المكرمة، مكتبة دار الباز، 10 جزء، 1414هـ/1994م.
19. البوطي، محمد سعيد رمضان، المرأة بين طغيان النظام الغربي ولطائف التشريع الرباني، دمشق، دار الفكر، المطبعة العلمية، 1996م.
20. بنت الشاطيء، عائشة عبد الرحمن، سيدات بيت النبوة، بيروت، دار الكتاب العربي، ط2، 1978م.
21. بيرنيا، حسن، تاريخ إيران القديم من البداية حتى نهاية العهد الساساني. د.م، دار الثقافة للنشر والتوزيع ، ط2، 1992م، ترجمة(محمد نور الدين وسباعي محمد ).
22. توماس بوا، تاريخ الأكراد. بيروت/ دمشق، دار الفكر المعاصر/ دار الفكر، 2001م. ترجمة من الفرنسية إلى العربية (محمد تيسير ميرخان).
23. الجزائري، فصل الخطاب في المرأة والحجاب،

24. الجزيري، عبد الرحمن، الفقه على المذاهب الأربعة، القاهرة، مطبعة دار المأمون،5 مجلد، 1938م.
25. الجهني، مانع بن حمّاد، الموسوعة الميسرة في الأديان والمذاهب والأحزاب المعاصرة، الرياض، دار الندوة العالمية، ط3، 2 مجلد، 1418هـ.
26. جواد علي، المفصل في تاريخ العرب قبل الإسلام، بيروت، دار العلم للملايين، 9 أجزاء، 1970م.
27. جورج.ع. خوام، المرأة عبر العصور، دمشق ، دار هارموني للطباعة ، 2001م.
28. الحموي، ياقوت ت:649هـ، معجم البلدان، تحقيق: مزيد عبد العزيز، بيروت، دار الكتب العربية، 5 مجلدات، د.ت.
29. خلاف، عبد الوهاب ،علم أصول الفقة ، الكويت، دار القلم ،1972م.
30. دروزة ، محمد عزة ، المرأة في القرآن والسنة، بيروت، المكتبة العصرية، ط3، 1404هـ/ 1984م.
31. الدسوقي، محمد عرفة ت:1230هـ، حاشية الدسوقي على الشرح الكبير للدردير، القاهرة، دار إحياء الكتب العربية، مطبعة البابي، 4 مجلد، د.ت.
32. الدينوري، أبو حنيفة، أحمد بن داود ت (282هـ): الأخبار الطوال، تحقيق (عبد المنعم عامر وجمال الدين الشيال). بغداد ، مكتبة المثنى، مجلدان، د. ت.
33. الذهبي، شمس الدين محمد بن أحمد ت (748هـ): سير أعلام النبلاء، تحقيق (شعيب الأرناؤوط). بيروت، مؤسسةالرسالة، ط23،4 مجلداً، 1406هـ/ 1986م.
34. الزركلي ، خير الدين، الأعلام، بيروت ، دار العلم للملايين، 8 مجلدات ، ط4، 1979م.
35. زهير حطب، علم اجتماع الأسرة ـ تطور بُنى الأسرة العربية، بيروت، معهد النماء العربي، ط3، 1983م.
36. رضا جواد ، نظم العائلة البابلي القديم ، بغداد ، مكتبة أندلس ، 1971م.
37. السباعي، مصطفى، المرأة بين الفقه والقانون، بيروت، مؤسسةالرسالة، ط 3 ،

1962م.

38. السحمراني، أسعد، من قاموس الأديان، الهندوسية والبوذية والسيخية،بيروت، دار النفائس،1419هـ/ 1998م.
39. سيد قطب، في ظلال القرآن، بيروت ، دار الشرق، ط7، 6 مجلدات، 1398هـ/ 1978م.
40. السيوطي، جلال الدين عبد الرحمن ت (911هـ): الجامع الصغير، تحقيق (محمد محي الدين عبد المجيد).القاهرة، دار خدمات القرآن، 2 جزء ، د.ت.
41. الشافعي، محمد بن إدريس ت: 204هـ، الأم، تصحيح: محمد زهري النجار، بيروت، دار المعرفة، 8 مجلدات، د.ت.
42. الشلبي، أحمد، مقارنة الأديان، القاهرة، مكتبة النهضة المصرية ، ط8 ، 4 مجلدات، 1986م.
43. الشهرستاني، أبي الفتح، محمد بن عبد الكريم، الملل والنحل ، تقديم (صدقي جميل العطار)،بيروت، دار الفكر، 1419هـ/ 1999م.
44. شيرين آميدي، المرأة وأمجاد اتحاد نساء كرد ستان، أربيل، مطبعة وزارة الثقافة، مجلد 1، 1998م.
45. الطبراني، أبو القاسم، سليمان بن أحمد ت:360هـ، المعجم الأوسط، تحقيق: طارق بن عوض وعبد المحسن الحسيني، القاهرة ،دار الحرمين،10 جزء،1415هـ.
46. الطبراني، أبو القاسم، سليمان بن أحمد، ت(360هـ): المعجم الصغير، تحقيق (محمد سليم سمارة)، بيروت، دار إحياء التراث العربي، د.ت.
47. طبارة عفيف عبد الفتاح، روح الدين الإسلامي، بيروت، دار العلم للملايين، ط17، 1977م.
48. الطبري، أبي جعفر، محمد بن جرير ت (310هـ): الجامع البيان في تفسير القرآن، بيروت، دار المعرفة، ط2، 12 مجلداً، 1398هـ/ 1978م.
49. الطبري، أبي جعفر، محمد بن جرير، ت (310هـ): تاريخ الطبري، تاريخ الأمم والملوك، تحقيق (محمد أبو الفضل إبراهيم). بيروت، دار سويدان ، 11 جزءاً، د.ت.

50. الظاهري، ابن حزم، علي بن أحمد ت (456هـ): الفصل في الملل والأهـواء والنحل، تحقيق (محمد إبراهيم نصر وآخرون).الرياض، مكتبة عكـاظ، 2 جـزء، 1402هـ/ 1982م.
51. عبد الكريم زيدان، الوجيز فـي علـم الأصـول، طهـران، مكتبـة احـسان، 1420هـ/2000م.
52. عبد الهادي عباس، المرأة والأسرة في حضارات الشعوب وأنظمتهـا، د.م، دار طلاس، 3أجزاء، 1987م.
53. عجاج نويهض، بروتوكولات حكماء صهيون، بيروت، دار الاستقلال والمؤسسة العربية للدراسات والنشر، ط3، 2 مجلد( 4 أجزاء)، 1990م.
54. قاسم أمين، المرأة الجديدة، القاهرة، مؤسسة أخبار اليوم، العدد 302، 1989م.
55. القرطبي، أبي عبد الله، محمد بن أحمد، ت (671هـ): الجامع لأحكام القـرآن، بيروت، دار إحياء التراث العـربي ، 20 مجـلداً ، 1405هـ/ 1985م.
56. القزويني، أبو عبد الله، محمد بن يزيد ت: 275هـ، سنن ابن ماجـه، تحقيـق :محمد فؤاد عبد الباقي، بيروت، دار الفكر، 2جزء، د.ت.
57. كازيوة صالح، المرأة الكردية في الألفية الثـالثة ، السليمانية ، مركز العـصر للطباعة والنشر ،2002م.
58. كامـل موسـى، أحكـام المعـاملات، بيـروت، مؤسـسة الرسـالة، ط2، 1415هـ/1994م.
59. الكبيسي، أحمد، فلسفة نظام الأسرة في الإسلام، أبـو ظبـي، مكتبـة المكتبـة، 1980م.
60. كتاب المقدس ـ العهد الجديد، د.م، دار الكتاب المقدس في الـشرق الأوسـط، 1996م. وقد ترجم من اللغة اليونانية.
61. كتاب المقـدس ـ كتب الشـريعة الخمسة ،بـيروت، دار المشرق ، 1986م.
62. الكبيسي، أحمد، فلسفة نظام الأسرة في الإسلام ،
63. كحالة، عمر رضا، إعلام النساء في عالمي العرب والإسلام، بيروت، مؤسـسة الرسالة، ط9، 5 مجلدات ، 1409هـ/ 1989م.

64. كمــال مظهــر أحمد ، المــرأة في التاريخ ، بغــداد ، دار الحوادث، 1981م.

65. مجموعة من العلماء، المنجد في الأعلام، بيروت، دار الشرق، ط21، 1996م.

66. محمد الحسون وأم علي شكر، أعلام النساء المؤمنات، طهران، انتشارات أسوة، 1411هـ/ 1991م.

67. محمد حسين فضل الله، تأملات إسلامية حول المرأة، بيروت، دار الملاك، ط4، 1413هـ/ 1993م.

68. محمد فريد وجدي، المــرأة المسلمـــة، دمشق، دار إحياء عــلوم الدين، د.ت.

69. محمد فريد وجدي، دائرة المعارف القرن العشرين، بيروت، دار المــعرفة، ط3، 10 مجلدات، 1971م.

70. محمد قــطب ، قــضية تحــــرير المــــرأة ، الريــــاض ، دار الـــــوطن ، 1410هـ.

71. المرزوقي، إبراهيم عبد الله، حقوق الإنسان في الإسلام، ترجمة: محمد حــسين مرسي، تقديم: حسن حفناوي، أبو ظبي، ط3 ، 2001م. رسالة الدكتوراه في جامعة أكستر في المملكة المتحدة عام 1999م.

72. المرغيناني، برهان الدين، أبو الحسن، علي بن أبو بكر، ت: 593هـ، الهدايــة شرح بداية المبتدي، مصر، مكتبة البابي، ط2،2 مجلد، د.ت.

73. المسعودي، أبي الحسن، علي بن الحسين ت (346هـ): مروج الذهب ومعــادن الجوهر، تحقيق (محمد محي الدين عبد المجيــد).بــيروت، المكتبة العصريــة، 4 أجــزاء ، 1407هـ/ 1987م.

74. مسلم، أبي الحسين، مسلم بن حجاج ت (261 هـ): صحيح مسلم بشرح النووي، تحقيق وتعليق (مصــطفى ديب البغا).دمشق ، دار العــلوم الإنسانية، 6 أجــزاء ، 1418هـ/ 1997م.

75. معن خليل عمر، علم اجتماع الأسرة، عمان، دار الشروق، 1999م.

76. ملك الحافظ، المرأة في ظلال الإسلام، دمــشق، مطبعــــة الكمــال الجديــدة ، 1993م.

77. المنذري، عبد العظيم عبد القوي ت: 656هـ، الترغيب والترهيب، تحقيق: إبراهيم شمس الدين، بيروت، دار الكتب العلمية، 4جزء، 1417هـ.
78. الناصف، منصور علي، التاج الجامع للأصول، بيروت، د.ن. ط4، 1395هـ/ 1975م.
79. الندوي، أبي الحسن علي، ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين، بيروت، دار الكتاب العربي، ط6، 1385هـ/ 1965م.
80. نور الدين عتر، ماذا عن المرأة، دمشق ، دار الفكر ، ط4، 1402هـ/ 1981م.
81. النيسابوري، أبو الحسين، مسلم بن الحجاج ت: 261هـ، صحيح مسلم، تحقيق: محمد فؤاد عبدالباقي، بيروت، دار الكتاب العربي، 5 أجزاء، د.ت.
82. هـ.ج.ولز، معالم تاريخ الإنسانية ، القاهرة، دار الكتب، ط3، 3 مجلدات ، 1972م، ترجمة عبد العزيز جاويد.
83. الهاشمي، رضا جواد، نظام العائلة في العهد البابلي القديم، بغداد، مكتبة الأندلس، 1971م.
84. هيني هارولد هانسن، حياة المرأة الكردية، بغداد ، مطبعة المجمع العلمي العراقي، 1984م.الترجمة من الإنكليزية إلى الكردية (عزيز كه ردي).
85. الوافي، علي عبد الواحد، المرأة في الإسلام، القاهرة، دار النهضة مصر، ط2، ،1979م.
86. ول ديورانت، قصة الحضارات، تقديم (محي الدين صابر). بيروت، دار الجيل، 42 جزء، 1971م، ترجمة زكي نجيب محمود.

# ئافرەت لە مێژوودا

## المرأة في التاريخ

لەم پەڕاوە ئەو بابەتانە بخوێنەوە:

1- ئافرەت لە ئاینی زەرادەشتی دا
2- ئافرەت لە سەردەمی بابلی دا
3- ئافرەت لە ئاین ونەتەوەو کۆمەڵگەکانی تری پێش ئیسلامدا
4- ئافرەت لە سەدەکانی ناوەڕاست لە ئەورپادا
5- ئافرەت لە ئیسلامدا
6- ئافرەت وشۆڕشی پیشەسازی
7- سەرهەڵدانی مافی ئافرەت
8- ئافرەت وئازادی

# ناوەڕۆک



دانەر لە چەند دێرێکدا:

- لە ساڵی 1959 لە گوندی قورشاغلو/ دەشتی هەولێر لە دایك بووە.
- لەساڵی 1976 لە دواناوەندی ئازادی دەرچووە.
- لە ساڵی 1982 لە کۆلێژی پزیشکی زانکۆی موسڵ دەرچووە.
- لە ساڵ 2003 لە بەیروت لە کۆلێژی ئیمام ئەوزاعی بروانامەی ماستەری لە لێکۆڵینەوەی ئیسلامی وەرگرتووە.
- لەساڵ 2008 لە هەمان کۆلێژ بروانامەی دکتۆرای وەرگرتووە.
- لە ساڵی 2008 ماستەری لە تەندروستی کۆمەڵ لە کۆلێژی پزیشکی/ زانکۆی هەولێری پزیشکی وەرگرتووە.

لە پەڕاوەکانی دانەر:

1- معجم أطباء محافظة أربيل 2004
2- المرأه الكرديه ودورها ف المجتمع الكردى 2004
3- وەرزش وتەندروستی 2007
4- پیاوان وژنان لە نێوان جیاوازی ویەکسان 2009
5- تەنها بۆ ئافرەتان 2009
6- ئەو پەڕاوەی لەبەر دەستتی بەڕێزتاندایە